# فەرهەنگا مایی

## کوردی - عەرەبی



طه مظهر مایی





خودانێ ئیمتیازێ
حافظ قاضی

سەرنڤیسەر
مؤید طیب





ئەدرێس

کوردستانا عیراقێ - دهۆک
ئاڤاهیێ ئێکەتیا سەندیکایێن
کرێکارێن کوردستانێ
قاتێ سێیەم
تەلەفۆن: ٧٢٢٥٣٧٦ - ٧٢٢٢١٢٥

www.spirez.org
www.spirezpage.net

دار سبيريز للطباعة والنشر
دهوك

- ژمارا وەشانێ: (٣١٢)
- ناڤێ پەرتووکێ: فەرهەنگا مایی (کوردی، عەرەبی)
- دانان: طه مایی
- دەرهێنانا هونەری: حسێن سەنعان مەتیخان
- بەرگ: بەیار جەمیل
- سەرپەرشتێ چاپێ: شێروان ئەحمەد تەیب
- چاپا ئێکێ
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارا سپاردنێ ل پەرتووکخانا بەدرخانیان ل دهوک (٥٠٠) ل سالا ٢٠٠٩
- چاپخانەیا حەجی هاشم / هەولێر

SPIREZ PRESS & PUBLISHER
DUHOK

# فەرهەنگا مایی

## کوردی، عەرەبی

دانان
طه مایی

2009 سپیریز

# فەرهەنگا مەلا تاهایێ مایی

مەلا تاهایێ مایی دەمەکێ دوور و درێژ ژ ژیانا خوە ب کۆمکرن، رێزکرن و ئامادەکرنا فەرهەنگەکا کوردی – عەرەبی ڤە بۆراند. هەر چەند وی هیڤی دکر ئەو بەرهەمێ خوە ب چاڤێن خوە ببینت، لێ قەدەر ژ حەزا وی بهێزتر بوو. ئەو چوو رەحمەتێ و ڤەرێژا کەدا وی یا ب سالان د جه دا ما.

فەرهەنگا مەلا تاهایێ مایی گەشتەکا دوور و درێژ پشتی مرنا وی کر. چەند کەسان ئەڤ فەرهەنگە ب کۆمپیوتەرێ نڤیسی. هندەکێن دی ئەو خواند و ڤەخواند. ئەو دووماهیێ ل وەشانخانەیا سپیرێزێ بوو مێهڤان. سپیرێزێ ژی د سالا ٢٠٠٥ێ دا کۆنترۆلکرن و ب سەرداچوونا فەرهەنگێ سپارت من. مخابن، من ئەو وەزیفەیا خوە ب جه نەئینا و ئەرکێ خوە تەمام نەکر. ئارێشەیێن تەکنیکی و مژوولاهیێن من یێن شەخسی ژ ئەگەرێن نەتەمامکرنا کارێ کۆنترۆلکرنێ بوون. لێ، سەبەبێ سەرەکی وە کر ئەز کۆنترۆلکرنا فەرهەنگێ راوەستینم ئەو بوو کو فەرهەنگ پێدڤی گوهۆرینەکا رادیکال بوو.

شاشیێن خالبەندیێ، چاپێ و رێنڤیسێ، یا ب تیپێن عەرەبی و یا ب تیپێن لاتینی، د ڤێ فەرهەنگێ دا گەلەکن. ئەز نزانم کا کێ ئەڤ شاشی کرنە چونکی ژ کەسەکی زێدەتر ئەڤ فەرهەنگە ب کۆمپیوتەرێ نڤیسیە و نوسخەیا ئەسلی یا رەحمەتی مەلا تاهایی ل بەر دەستێ من نینە. مەلا تاهایی کاتاگۆری (توخمێ) پەیڤێ، کا ناڤە، سفەتە، کارە، دیار نەکریە و هندەک فۆرمێن پەیڤێ، وەک "ئارامتر"، نڤیسیە کو فەرهەنگساز نائێخن د فەرهەنگێن خوە دا.

رەحمەتی هەول دایە پەیڤێن کوردەواریێ د فەرهەنگا خوە دا قەید بکت. هەمان وەختی دا، وی ئەو پەیڤێن کو وی ب خوە ژی ئافراندنە، وەک "ئاخپیڤ" هەمبەری "مەسساح" یا عەرەبی یان "ئەژمێر" بەرانبەر "عەدداد" یا عەرەبی، لێ زێدە کرنە. هندەک پەیڤ د فەرهەنگێ دا هەنە، وەک "ئەرمانج گهشتن" یان "ئاخفتن بون"، کو ل گۆر قالبێن پەیڤسازیا کرمانجی غەریبن هندەک جاران پەیڤ و شرۆڤەیا وێ نە ژ یەک توخمن؛ بۆ نموونە: "ئاگر بارین" کارە، لێ شەرحا وێ "چەکێ ئاگر رێژ" ناڤە.

د سەر وان هەمی قسوورێن کو د ڤێ فەرهەنگێ دا هەنە، ئەڤ بەرهەم ژ لایێ دیرۆکی ڤە منایەکێ گرنگ و ب قیمەتە. رەحمەتی مەلا تاهایێ مایی ب رێیا ڤێ فەرهەنگێ گەلەک پەیڤێن کێمناس، کەڤن و رەسەن بۆ مە و نفشێ نوو پاراستنە. ئەڤ فەرهەنگە حەزکرن و دلسۆژیا مەلا تاهایی بۆ پەیڤا کوردی و بزاڤ و خەبتینا وی بۆ ڤەژاندنا وێ و هەول و تێکۆشینا وی بۆ ئافراندنا وێ بۆ مە دیار دکت. سپیرێز ب وەشاندنا ڤێ فەرهەنگێ خزمەتەکا هێژا بۆ زمانێ کوردی دکت و رێز و حورمەتێ ددت رەحمەتی مەلا تاهایێ و کەدا وی یا ب رەنج و دەمدرێژ.

**نەوزاد هرۆری**

**ستۆکهۆلم / ٢٠٠٨/٣/١٤**

# كورته ژينا طه مايى

* طه مـايى: كـورێ شێخ (مظهرێ) كـورێ شێخ (طه)يێ مـائيـيـه ژ بنهمـالهكـا ديندارو ئايين پهروهرو رۆشنبـيـرو زانيـاريه، بنهمـال و بنهكـارا ڤێ بنهمـالێ ژ رهگـهزدا ژ مـيـرهبهگـێت (ئهلكێ) نه، ئهلكێ گـوندهكه ل كـوردسـتـانا باكۆر نۆكه دبێژنێ (بێى شهباب).
* سهروهر و پێشيێ ڤێ بنهمالێ (مير حهسهن)ێ ميره بهگى بوو، ميرێ دهڤهرێ بوو.
* كـورهكێ مـيـر حـهسـهنى يێ كـو دبێـژنێ((دهل)) يێ ژ ئهلـكێ مـشـهخت بوى و هاتيـيه ناڤ بهروارى ژۆريا و ل گوندێ بێدوهێ ئاكنجى بوويه.
* پشتى چهند بابهكا (مهلا ئيبراهيم) ئێک بو ژ نهڤێت (دهلى) ژ گوندێ بێدوهێ دهێته گوندێ مايێ لێ ئاكنجى دبيت، بێدوه و مـايێ دوو گوندێت هەڤـتوخيبن د مشـارا ژۆريا بهروارى بالآ دا دوو گـوندێت ب ئاڤ ودار و بارو دهرامهت وكانينه.

گـوندێ مـايێ، گـوندهكێ ب ناڤ و دهنگ بوو، بۆ رهوشـهنبـيـرى و زانين و تێگەهشـتـنێ، ههروهسـا ژ لايێ جوگرافى ڤه، گوندهكێ بهربهاڤ و خوهش و دهست دايه بۆ ههمى رهنگێت دهرامهتى و گهلهكا ب هاتنه، ههر سالێ پتر ژ نيڤ مليون كيلوگرامێت فێقى ل ئاقارێ وى دكهڤن، ژبلى دارگويز و داروبارێت دى، ههروهسا نێزيكى (٥٠) كانيێت ئاڤا زهلآل لێ ههنه و رويبارهک دبهردا دبۆريت. چهند ئاش و مهدرهسه و تهكيايهک لێ ههبوون، جهێ زانين و رۆشهنبيرى و علم و مهعريفهتێ بوو ل دهڤهرێ.

* ژ طه مايى حهتا مير حهسهنى بابكالكێ وان چارده (١٤) بابن، ژ وى حهتا مهلا ئيبراهيمى ههشت بابن.
* باپيرێ طه مايى (شێخ طه) ئێک بو ژ شێخێت طهريقا نهقشهبهنديا و شاعيرهكێ كوردێ كلاسيكى يێ ب ناڤ دهنگ بوو.
* بابێ طه مـايى (شێخ مظهر)ێ مـايى رێكا بابێ خوه گرت و بو شێخـهكێ زانا و رۆشـهنبـير ل دهڤهرێ ورۆلهكێ مـهزن ديت ژبۆ دانانا مـهدرهسـا و جـهـێن زانينێ ل ناڤ بهروارى بالا و ئينانا گـهلهک خێـرو خۆشـيـا بۆ ناڤ بهرواريا، وهكى (سێڤ) و گـهلهک رهنگێت دى بهرى وهختى ل ڤێ دهڤـهرێ نههات بوون چاندن..... ههروهسا شێخ مظهرێ مايى، ژێدهرێ سهرهكى بو ل دهڤـهرێ، دهرههقـا زانين و زانيـاريا، چ دينى يان دونـيـايى، ديسـان مهدرهسهيهک و تهكيايهک ل مال ههبوون جهێ دهعوهكار و داخازكهرێن زانين و زانياريێ بوون، جهێ مێڤانداری و خهلكێ دهست كورت بوون.
* طه مايى د ناڤبهرا ١٠-١٨ مهها شواتێ سالا ١٩٢٤ێ هاتى يه دونيايێ، ههر ل وێ سالێ ل مهها ئيلۆنێ يێت مشهخت بووين چۆينه قهزا (چهلێ) ياكو نۆكه تورک دبێژنێ چوقورجه.

ئهگـهرا مشـهخـتـيێ ژى ئهو بوو چونكى هێزێن ئنگليـزى و فـهلێت تيـارى هێرش ئينا سـهر دهڤـهرێ و گـوندێ (مـايێ) سـۆت و كـتـێـبـخـانا شێخ طه مـايى ژى سۆت و گـوندێت دهوروبهرێ مـايێ ژى ههمى سـۆتن وخـهلكێ وێ مشهخت بوونه دهڤهرا چهلێ.

سێ سالا مـانه ل قهزا چهلێ، ل وى دهمى شورهشا شێخ سهعيدێ پيران دهست پێكر بوو، كاودانێت دهڤهرێ ژ لايێ سياسى و ئابوريڤه دئالوز بوون، ژبهر كو بابێ طه مايى (شێخ مظهر) شێخـهكێ طهريقا نهقشـهبهنديا بوو،

هەروەسا سەرکێشێ شورەشێ شێخ سەعیدی پیران شێخەکێ نەقشەبەندی بوو.... رژێما تورکی دترسیا پەیوەندیەکا بهێز دناڤبەرا شێخ سەعیدێ پیران و شێخ مظهر مایی دا پەیدا ببیت و ئەو ژی پشتەڤانیا شۆرەشێ بکەت.

ژبەر ڤێ یەکێ حکومەتا تورکی دڤیا شێخ مظهرێ مایی دگەل کەسوکارێت وی ڤەگوهێزیتە کویراتیا عەردێ تورکیا، وەک نەفی ببەنە باژێرێ (قونیایێ).

بەلێ هەر ل وی دەمی دزڤرنەڤە عێراقێ، لێ حکومەتا عێراقێ ناهێلیت بچنە گوندێ خوە مایێ نەچار دبن قەستا ناڤ دۆسکیا دکەن ودوو سالا دمینە ل گوندێ [بەندا]، پشتی دوو سالا ڤەگەریانە ڤە مایێ.

* ل سالا ١٩٣٥ طە مایی چۆ گوندێ (بامەرنێ) داکو خاندنا خوە یا مەکتەبێ ل وێرێ بخوینیت، هەتا پۆلا پێنجێ خاند و پۆلا شەشێ تمام نەکرو ل سالا ١٩٤٠ ژبەر چەند ئەگەرێن سیاسی خاندنا خوە هێلا.

* هەر ل سالا ١٩٤٠ێ دچیتە دناڤ ریزێت کۆمەلا هیوا (هیڤی) دا داکو خزمەتا دۆزا کوردی بکەت و ناسناڤێ خوەیێ حەرەکی کرە ((ئلهو)).

* ١٩٤٣ طە مایی ژن ئینا، لێ هەر زویکا ژبەر کو خاندنا خوە تمام نەکر بوو ژ ئەگەرا دویراتیا گوندێ مایێ ژ جهێت زانیاری و رۆشەنبیریێ و ژ ئەگەرا مژویل بونا وی ب کارێن سیاسی ڤە، پەشیمان دبیت ونەچار دبیت کو هەولێ بدەت ئەو بخۆ بزاڤێ بکەت کو زانین و زانیاری و رۆشەنبریێ پەیدا بکەت.

سالا ١٩٤٣ ژ ئەگەرا ڤێ یەکێ پەیوەندیێ ب بنەمالا بەدرخانیا دکەت و، ل وی دەمی میر جەلادەت بەدرخانی ل شامێ هەر دوو صەحیفێن کوردی (هاوار) و (روناهی) دەردئێخستن طە مایی ب واسطەی پۆستێ وی دەمی تێکەلیێ پەیدا دکەت و هەمی ژمارێت وان ب ئەگەرا پۆستەی ئەو ژی بو طە مایی دهێنە گوندی.

هەروەسا دکتور کامران بەدرخانی ل بێروتێ هەر دوو صەحیفێن [رۆژا نوو و ستێر] دەردئێخستن و ژمارێت وان ب رێ یا پۆستەی بۆ طە مایی دگەهشتن گوندی)

هەروەسا دکتور کامیران بەدرخان ل روژا ١٩٤٣/٦/١٨ نامەکێ دگەل وێنێ خوە دگەل صەحیفێن خوە (رۆژا نوو و ستێر) بۆ طە مایی دهنێریتە گوندێ مایێ.

* ژبەر کو طە مایی هەر ژ سالێن چلادا یێ چاڤ ڤەکری و رۆشەنبیر بوو ل دەڤەرێ، هەردەم تێکەلیا وی دگەل مرۆڤێن رۆشەنبیرو سیاسی و زانا بوو... هەر وەکی مە گۆتی تێکەلیەکا باش دگەل مالا بەدرخانیا هەبوو، تێکەلی و هەڤالینیا شاعرێ کورد( مەلا ئەحمەدێ نالبەند) دکەت و نالبەند دبیتە هەڤالەکێ نێزیکێ طە مایی... ژبەر ژاری و دەردەسەریا مەلا ئەحمەدێ نالبەند تووشی بووی، نەکامیا کەسوکارو خەلکێ دەڤەرێ دکەت، چونکی ل وی دەمی نالبەندی کەسێ خوە نەبوو ئو کەس لێ نە دبوو خودان، بتنێ طە مایی نەبیت ئەڤژی د نامەکێدا دیار دبیت دەمێ ئەحمەدێ نالبەند بۆ طە مایی دهنێریت و تێدا مەدحێت وی دکەت.

ڤێ نامێ دگەل ژیانا خوە و هۆزانەکێ بو دهنێریت تێدا ناڤێ طە مایی دئینیت.

* طە مایی ل دەستپێکا سالێن ١٩٤٠ێ دەست ب هۆزان ڤەهاندنێ دکەت و ژبەر کو «مەلا ئەنودر مایی» ژ بنەمال و پسمامێن طە مایی بوو ئو هۆزانڤانەکێ زێهاتی بوو هەر دوو خەلکێ گوندێ مایێ بوون، ژبلی تێکەلیا روشەنبیری و زانیاری و سیاسی، هەردووکا وەک دوو هۆزانڤان و رۆشەنبیرێن دەڤەرێ سەرهلدا.

* هەروەسا تێکەلیێ دگەل شەهیدێ ئازادیێ سەیدا (صالح یوسفی) پەیدا دکەت و بۆ جارا ئێکێ ل باژێرێ مووسلێ مایی دچیتە مالا سەیدا سالح یوسفی ل ناحێ (باب لکش) و پێکڤە کارێ سیاسی دکەن.

ل وی دەمی هێژا صالح یوسفی بەر برسێ لق ١ حزبێ بوو هەروەسا طە مایی بەرپرسێ رێکخراوا بەرواری بالا بوو.

بۆ ماوەکێ درێژ طه مایی پۆستێن حزبێ ژ لیوا مووسل ژ دەڤ سەیدا صالح یوسفی دئینیت ل دەڤەرێ بەلاڤ دکەت.

* طه مایی هندی شیای کتیب و پەرتوک ل خوه کۆم دکرن و گەلەک دەست نڤیس و تێکستێن کەلەپۆری دکتێبخانا خوەدا جەماندن هەمی رەنگێن کتێبا دخاندن و خرڤە دکرن، هەمی بابەتێن زانیاری- فەلسەفی- ئابۆری- کۆمەلایەتی سایکۆلۆژی- ئەدەبی- دینی وئاینی- مطالعه دکرن.

هەتاکو کتێبخانا وی بوبە مەزنترین و زەنگینترین کتێبخانە ل دەڤەرا بەهدینا ل وی دەمی ژمارا کتێبێت وی گەهشتنە (١٥٠٠) کتێبا.

* طه مایی ئێک بوو ژ ئەندامێت وەفدا کوردستانێ، پیرۆزباهیا شۆرشا ١٤ تەموزێ و ل رۆژا ١٩٥٨/٧/٢٢ چۆینە باژێرێ بەغدا بۆ دیدارەکێ دگەل(عەبد الكريم قاسم)ی.

ل رۆژا ١٩٥٨/٧/٢٧ چاڤپێکەڤتنەک دگەل عەبدالکەریم قاسمی کرو ل رۆژا ١٩٥٨/٧/٢٩ێ گوتارەک ل ئێزگێ کوردی ل بەغدا ژ پێش وەفدا دەڤەرا ئامێدیێ ڤە پێشکەشی جەماوەری کر.

* پشتی سالا ١٩٥٨ێ ناسینی دگەل سەرۆکێ هێژا (مەلا مصطفی) بارزانی دکەت.

* لسالا ١٩٧٠ێ پشتی بەیانا ١١ی ئاداری شعرێت (ئەحمەد مخلص نالبەندی) بەرهەڤ دکەت ژبۆ چاپێ ل دویڤ داخازا سەرۆک (مەلا مصطفی) بارزانی.

* طه مایی ل رۆژا ١٩٧١/٥/١٠ ژبۆ چاپکرنا هۆزانێت نالبەندی ب هاریکاریا سەیدا صالح یوسفی دچیتە دەڤ (زكي جابر) وەکیلێ وەزارەتا راگەهاندنێ، دچیتە رێڤەبەریا رەقابا گشتی ودچیتە رێڤەبەریا (دراسات کوردیه)، لێ دناڤبەرا ڤان هەمی دەزگەهادا و ل دوماهیێ موافقه ناهێتە کرن ژبو چاپکرنا دیوانا (نالبەندی).

* پ شتی بەیانا ١١ی ئاداری قۆناغا دوێ یا هۆزان نڤیسینێ دەست پێ دکەت و د ماوێ سالا ١٩٧٠-١٩٧٩ چەندەها هۆزانێت جوان و رێک و پێک و پڕ بها دنڤێسیت.

* ل روژا ١٩٧٨/٧/٩ رژێما بەعسا عەفلەقی گوندێ مایێ دگەل گوندێت دەڤەرێ و کوردستانێ هەرافتن و سۆتن.

طه مایی پشتی وێرانکرنا گوندێ مایێ نەچار دبیت دچیتە ئوردیگایێ (قەدش)، ل ڤی دەمی زەلامێن رژێمێ پێکولێ دکەن کو طه مایی بیننە باژێرێ دهوکێ و ژبارا وی خوەش کەن وخانیەکێ باش بدەنێ لێ ئەو رەفض دکەت و دچیتە ئوردیگایێ قەدشێ و دگەل هەژارو دەربەدەرێن کورد.... د ڤی ئوردیگای دا ب ژیانەکا سادە و کاودانەکێ ب زەحمەت دبۆربنیت و خوە وەکی هەر دەربەدەرەکێ کورد دزانیت ژیارا ناڤ خەلکێ خوە بێ هەژار دچیترینیت ژ ژیانا ناڤ باژێری و دگەل زەلامێن حکومەتێ.

ئەڤەژی نشتیمان پەروەری و وەکهەڤیا طه مایی ددەت خوەیا کرن.

* ل سالا ١٩٧٣ێ دبیتە ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێت کورد تایێ دهوکێ وپشکداریێ د میهرەجانا ئێکێ یا شعرا کوردی دا دکەت ل سالا ١٩٧٣.

* ل سالا ١٩٧٩ێ پشکداریێ د میهرەجانا (سیێ) یا شعرا کوردی دا کر ل باژێرێ سلێمانیێ.

* ل رۆژا ١٩٨٥/٧/٥ رژێمێ طه مایی ژ ئوردیگایێ (قەدش) دەرئێخست و کتێبخانا وی دگەل هەمی تشتێت وی مصادەرە کرن و ل ئەمنا ئامێدیێ دەست دانا سەر، پشتی هینگێ ڤەگوهاستە (ئەمنا) پارێزگەها دهوکێ.

* ل رۆژا ١٩٨٧/١٢/١ پشتی رێکەکا مشتی ئاستەنگ و نەخۆشی ژ ناڤ بەرواریا دچیتە دەڤەرا هەکاریا

لناڤ تورکیا و ب هاریکاریا چەند لایەنەکا د عەردێ کوردستانا تورکیا دا دگەهتە توخیبێ ئیرانێ و دچیتە بازێرێ (ئورمییێ) ل رۆژا ٣٠/١٠/١٩٩١ پشتی سەرهلدانا مەزنا خەلکێ کوردستانا عیراقێ..) و رزگارکرنا وەلاتی ژ سیخورِ و دام ودەزگەهێن رژێما عەفلەقیا بەغدا ژ ئیرانێ ڤەدگەرِیتە ڤە کوردستانا ژێری و ل بازێرێ دهۆکێ ئاکنجی دبیت.

* ب ئەگەرا کاودانێت سیاسی ل دەڤەرێ بەرهەم و کتێب و وەسیقێن طە مایی هەمی دهێنە سۆتن و تەلافتن.
* بەرهەمێن وی یێت ئەدەبی و زمانی ئەڤ فەرهەنگەیە دیوانەکا هوزانێت نازک و ژێهاتی.

# پەیڤێن کرمانجی

من ل سالا ۱۹٤۰ دەست ب خڕکرنا ڤان پەیڤا کر دەمێ من پیروکالێت مە دیتین هندەک پەیڤا دزانن و پێ دئاخڤن کەسێ دی ژبلی وان نەدزانن و نە پێ دئاخڤن. لەو من دیت کو یا پێدڤییە ئەڤ پەیڤە بهێن پاراژتن بەری ئەڤ پیروکالەنە بمرن و ئەڤ پەیڤە دگەل مرنا وان بەرزەبن و جهێ وان بمینیت ڤالا و پەیڤێن بیانی بخشن و شوینا وان بگرن.

من دەست هاڤێتە نڤێسینا ڤان پەیڤا بەلێ گەلەک پێڤە نەچۆ من دەست ژێ بەردان وئەز مامە بدویڤ کوردینیێ ڤە وکەتمە خەبات و بزاڤا بەلاتیڤی یانی سیاسی ئو ئەز تێکەلی کۆمەل و پارتێت کوردایەتیێ بوم. دەم سال بۆرین و چۆن هەتا سالا ۱۹۷۲پشتی ئەز ژ بەرهەڤ کرنا شعرێت شاعرێ ب ناڤ و دەنگ ئەحمەدێ نالبەند سەراست بویم بۆ چاپ کرنا دیوانا وی لدویڤ داخازا بارزانییێ نەمر مەلا مصطفەای. رۆژەکێ من کتێبخانا خوە ب سەروبەر دکر دەستێ من چۆ سەر وان پەیڤا و ئەز ب سەر هەلبوم. من دیت یا چاکتر ئەوە ئەز دەست بهاڤێژمە ڤە ڤی کاری بەلێ ب ئاوا و رەنگەکێ گشتی و بەرفرهەتر ئو هەمی پەیڤێت ناڤخوەیی یێت دەڤەرا ئەز لێ دژیم بنڤێسم بەلکو پاشەرۆژەکێ مافەک ژێ بهێت دیتن بۆ ئەزمانێ کوردی، چنکو لدویڤ باوەریا من ئەگەر هەر رەوشەنبیرەکێ کورد جهێ ئەو لێ دژیت ب کارەکێ هۆسا رابیت و پەیڤێن وێ دەڤەرێ ڤێکبێخیت وکۆم کەت دێ ئەزمانێ کوردی ساخ کەت. ئو دێ بینین کو ئەزمانێ مە یێ کوردی ئەزمانەکێ زەنگین ودەولەمەندە و ئەم هەوگار و پێدڤی نابین ژ چو ئەزمانێت دی وەرگرین. من دەست بنڤێسینا پەیڤێت ناڤخوەیی کر و خڕکرن هندی ئەز شیبای، دیسا نامەکا گەرەودار (مضمون) بۆ سەیدا دکتور عبدالرحمن معروف نڤێسی(۱/٤/۱۹۷۸) کو سەیدایەکێ شارەزاو هۆستایە د زانیاریا فەرهەنگی و زمانیدا شیرەتێ ل من بکەت کانێ چاوان ژێک بەشین و ژێک ڤەزانا پەیڤا چێکەم باشترە؟ چنکو هەتا نۆکە زمانزانێت کورد هۆسا یێت پێ رابوین :(بلند ـ بلند بون ـ بلند کرن ـ بلندی) بەلێ تشتێ زێدەتر یێ هەی وەکی (بلند بوی ـ بلندکری ـ بلندتر ـ بلنداهی ـ بلندیاتی بلندینی) بەلێ من چ بەرسڤ ژ دکتۆری نەوەرگرتن. من ل دویڤ زانین و تێگەهشتنا خوە دەست ب نڤیسینا پەیڤا کر بەلێ گەلەک نەڤەکێشا ئەم تویشی هەلنگافتنا شۆرەشا ئیلۆنێ بوین ل سالا ۱۹۷۵، رژێمێ وەلاتێ مە گرتە ڤە و ئەم کەتین بن ریپ و دنگزێ ڤێ رژێما دورندە وخوینرێژ و توخمپەرێس، دەم و گاڤێت مە کرنە ژەهرەمار و دەراڤێت مە ل سەر مە قەلس و بەرتەنگ بون و ئەم کەتین ختی و دەردەسەریەکا بکوتەک دنیا ل مە ئینا ئێک، بەلێ دگەل ڤێ چەندێ ژی ئەز هەر مامە ب شولێ خوە ڤە هێدی هێدی ئەز هەر تێخەبتیم و من پەیڤێن خوە ڤێک جەماندن. هەتا سالا ۱۹۷۸ ل مەها هەفتێ رژێمێ ئەم ژ گوندێت مە هەلشکافتین و گوند هەرافتن و سۆتن و روی ئەردکرن ئو ئەم ڤەگوهازتین ئۆردیگایێت ب خورتی.

ئەز ل ئۆردیگایێ (قەدشێ) ل ناحیا سەرسنکێ ئاکنجی بوم ل بن چاڤدێریا ڤێ رژێما نفشپەرێس ئەم زۆر پەریشان و تەنگاڤ حال بوین. کەتین ئالوزی و گرفتارییا و دڤێ قەلبەندیێ دا مە بەر نەما ل چو تشتا ژبلی پاراستنا خوە پێڤە ژڤان ئافاتا قورتال و دەرباز بین. بەلێ لگەل هندێ ژی ئەز مامە ب شولێ خوەڤە وپێڤە چۆم و ئەو پەیڤێت من لێکدای و ڤێک ئێخستین من دەست هاڤێتێ ل دویڤ تیپا ژێک ڤاڤارتن و ژێک ڤەدەرکرن. بەلێ

هێـژ ئەز ژێ خلاس نەبویم ل سـالا ١٩٨٥ رژێما هۆڤ ئەز ژ ئۆردیگای دەرئێـخسـتم، تشـتێ من پێ چێبـوی ئەڤ پەیڤێت من ژێک جداکری دگەل هندەک تشتێت ل نک من خودان نەرخ و بهاگران وەک شعرێت نالبەندی و دیوانەکا جزیری یا دەست خەتێ محمد طیار پاشایێ کورێ سمایل پاشایێ میر سێڤدینا بەهدینا ، شعرێت خوە من ژ کتێبخانا خوە ڤەگوهازتن مالا هەڤالەکی، بەلێ ب داخ و مـخابن ئەو پەیڤێن نەجودا کری من هێلان د کتێبخانا خوە دا ئەز چۆمە دەڤەرا رزگار و ئازادکری ل ناڤ شۆرشا کوردی. رژێمێ ژی تشتێ من هەمی دگەل کتێبـخانا من دەست دانا سەرو مصادەرەکرن. دەمێ ئەز گەهشتی دەڤەرا ئازاد من ل وێرێ چەقچەقۆکا نڤێسینێ (الە الطابعە) پەیدا کر داکو ڤی کاری پێ ڤ سەرەکی بێخم. بەلێ من دیت ئەڤ دەڤەرە ئێکجاری ب کێر شۆلەکێ هۆسا ناهێت مرۆڤ بکەت ل بن بومبەبارانا تۆپ تەیارا ئو خوە ڤەشارتنا دکونج وکونا ڤە ژبەر ئێرەشێت فرۆکا مرۆڤ نەدشیا ل چو ئەردا بتەبتیت وتەنا ببیت ودا شۆلەکێ هۆسا بکەت. ئو ل سالا ١٩٨٧ من ئەڤ دەڤەرە هێلا وئەز ڤەرێ بوم بۆ جهێ ئیرانێ.

ل ڤی جهێ بیانی ونەنیاس من دیت کو بۆ من خوەش دەلیڤە و دەرفەتە هەلکەتی کو ئەز خوە ب ڤی کاری ڤە مژویل کەم و وەختێ خوە پێ رابۆرینم و ژێ سەر راست ببم. ل وێرێ ئەز و سەیدایێ هێژا (فەلەک الدین کاکەیی) بەرپرسێ راگەهاندنا پارتا دیموکراتیا کوردستانێ ل خازگینیەکێ تێک تەشقلین و مە ئێک ودو نیاسی. من ژ سەیدای خازت ئەگەر چەقچەقۆکەک هەبیت ب ئەمانەت بدەتەڤ من دا کارێ خوە پێ ب دوماهی ببنم. سەیدای ژی ژ کەرەما خوە بۆ من زوی چەقچەقۆکەک هنارت و من دەست ب نڤێسینا خوەکر، بەلێ یا مـخابن ئەز نەشیام ژ دانەکێ پتر بنڤێسم ژبەر بها گرانییا کاغەزێ و دەست کورتیا خوە. لەو ئەز نەشیـام ڤان پەیڤا شرۆڤە کەم، و من شرۆڤەکرن و هندەک کارێت دی ژی هێلان برێڤە.

جارەکێ وەسا هەلکەت ئەز و سەیدایێ هێژا (سامی عبدالرحمن شەنگالی) سەرۆکێ پارتا گەلی کـوردستان ڤێک کەتین و ئەم پێک هاتین دەر و نیاسین ل ناڤبەرا مە چێبو. سـەیدا ژ من پرسی کـانێ ئەز چاوان وەختێ خوە دەرباز دکەم؟

من چێروکا ڤان پەیڤا کر و گۆتی: ئەز نەشیام ژ دانەکێ بتنێ پێڤە بنڤێسم و ئەز دترسم هەکە ئەو ژی مەزخت ئەڤ وەستانا من هەمی چۆ ب ئاڤێدا و ئەز بومە پالێ پویشی. سەیدای گۆتە من: خەمێ نەخۆ شۆلێ تە پویچ نابیت و ئەز ئامادەمە چەند دانا حەزکەی ئەز دێ بۆتە ب دەستگاهێت خوەبێت نڤێسینێ وێنە کەم. من ژی ژێ داخاز کر (سێ) دانا بۆ من وێنە بکەت.

وی ژی ب مەردانە بۆ من سێ دانە وێنە کـرن هەمی سەروبەر و کـاغـەز ژکیسـتێ وی. ل ئیرانێ ئەز چۆمـە نک (فەرهەنگ و ئەدەبیاتێ کوردی ـ انتشارات صلاح الدین) من ژێ خازت کو ڤان پەیڤا چاپ بکەت. بەلێ وان داخازا لێ بۆرینێ ژ من کر و گۆ: مە خوەندەڤانێت کرمانجی نینن ئو هندی مە پەرتوک ب زاری کرمانجی چاپ کری زبانا گەهاندی مە ژبەر ڤێ ئەگەرێ ببەخشە ئەم نەشێین چاپ بکەین. پشـتی ئەز ژ جهێ ئیرانێ زڤریە کوردستانا عیراقێ ل پاویزا سالا١٩٩١، هەڤالا زانی من ئەڤ پەیڤە بێت خلاس کرین. وان گۆتە سکرتاریا بەرەی کوردستان ل دهوکێ کو بەلکی ڤـان پەیڤـا چاپ بکـەین، سکرتاریا بەرەی ژی لبـەر هات کـو چاپ بکەن. هیـڤـیـا من ژی گـەش بو، بەلێ دویماهیکێ ئەو هیڤی چرمسی ڤە چنکو بەرەی خوە ژێ داپاش و ب پشت گوهێ خوە ڤە هاڤێت!!

ل دویڤرا پارتا یەکەتی نشتیمانی کـوردستان ب ستوێ خوە ڤەگرت کو چاپ بکەت هیڤیا من هەلبو ڤە و گەشتر بۆ من گۆت: نۆکە ئەڤە هاتە چارەسەرکرن بێ شک ئەڤ پەیڤە دێ روناهیێ ببنن. ئو من ڤرێکرن (هەڤلێرێ) بو چاپ کرنێ. بەلێ مان ل چاڤ رێ چاپ کرنێ پاشی سالەک ب سەر ڤە چۆی بۆ من زڤرین ڤە هەروەکی خوە. پشتی دەمەکی

سەیدایێ هێژا (کریم سلطان) شەنگالی داچیتە (سویدێ) گۆتە من ئەز دێ دانەکی دگەل خوە بەم بەلکو ل(سویدێ)کەسەک خوە دبەر را ببەت و چاپ کەت.

دەمێ سەیدا ڤەگەڕهای گۆتە من: من یا دایەڤ هەڤالەکێ خوە ژ کوردستانا باکۆر ل وێرێ ناڤێ وی سەیدا (زین العابدین قایا) ئەو دێ پێ رابیت وچەند دانەکا ب کومپیوتەرێ دێ بەرهەڤکەت. ل ڤێرێ دڤێت ئەز سوپاسی و رێزگرتنێ ژ بیر نەکەم بۆ هەر برادەرەکێ دەستێ هاریکارییێ بۆ من درێژکری، نەمازە سەیداییێت رێزدار و قەدرگران (فلک الدین کاکەی) و سەیدا (سامی عبدالرحمن شەنگالی) و سەیدا (کریم سلطان شەنگالی) و سەیدا (زین العابدین قایا) ل سویدێ و هەر برایەکێ دەست بارا من گرتی و بیرا من نەهێت.

بێ گومان هەر شۆل و کارەکێ مرۆڤ بکەت جهێ خەلەتی و کێماتی و ژ بیرکرنایە نەخاسمە ل دەراڤێت هۆسا نەراوەستای و نەتەنا کو مرۆڤ تێدا وەکی بەرگێرەکێ بیت ل چۆ عەردو جها نەتەبتیت و نەحەوهیت، شۆلێ مرۆڤ دکەت هەر دێ یێ پەلۆسە و شەپلی بیت و پری خەلەتی بیت، ئەڤە ژلایەکی ڤە. ئو ژلایێ دی ژی ڤە کو هەر دەڤەرەکێ زارێ خوە یێ هەی ئو هەر ل وێ دەڤەرێ ژی گوندێت وی ژێک جدایی ل ناڤبەرا ئاخفتنا وان یا هەی ژبەر ڤێ ئێکێ کەسەک نەشێت هەمی پەیڤێت دەڤەرێ ڤسەرا بگەهیت. ژبەر ڤێ هندێ بێ شک مشە خەلەتی و نەزانین دێ هێنە بەرچاڤ وپەیدابن.

بەلێ پا من هەر هندە پێ چێبو ئەز نەشیام ل ڤان دەراڤێت ئەز تێراربۆریم و دەرفەتێت نەتەنا یێت ئەز لێ دەرباز بوی ژ ڤی رەنگی چێتر چێکەم.

هیڤیدارم ژ خوێندەڤانێت رێزدار ل من ببۆرن. ئو ئەز یێ پر هویڤی مە کو ئەو دێ هاریکارییێ بۆ من کەن کو هەر کەسێ خەلەتیەک یان کێماتی و ژ بیر کرن ونەزانینەکێ تێدا ببینیت من ئاگەهدار کەت ب رێکا ئێکەتیا نڤێسەڤانێت کورد ـ تایێ دهۆکێ) بەلکو ئەگەر جارەکا دی وەسا چێبو ئەڤ پەیڤە بهێن ڤە چاپ کرنێ ب کاروکۆکەکێ سبەهیتر و شەنگ ورێک و پێکتر بهێن دیتن. جارەکا دی ئەز رێز و سپاسییا خوە پێشکێشی سەیدایێ هەژی (زین العابدین قایا) دکەم کو وی خوە دابەر ڤێ هاریکارییێ دا یا وی بۆ من کری هیڤی ژ خودێ مەزن دکەم کو برایێت وەکی وی دلسۆژ و مەردانە و خەبات کر بۆ کوردستانێ زێدەکەت و دەستێ وان بگریت. بەلێ بۆ مرۆڤی جهێ داخ وکۆڤانانە کو رەوشەنبیری و تۆرە و ئەزمان ساخ کرنێ نرخ و بهایێ خوە ل کوردستانەکا سەربەست و ئازا و فیدرالی کو خەونا مللەتییە بجە هاتی نەبیت ئو پویتە بکارێت رەوشەنبیری نەهێتە کرنێ و جهێ خوە لێ نەبینیت و رێکا خوە بگریت ئو ل ڤی وەلاتی کێشان و پیڤان ب ترازیەکا ئالی سەنگ بهێتە هەلسەنگراندن کو کارێت زانیاری و رەوشەنبیری بڤێت نەڤێت نەچار بێن مشەخت بێن و بچن وەلاتێت بیانی وەکی ئەوروپای دا وەکو رێکا خوە ببینن وبهێن پێش چاڤا و بەر رۆناهیێ. من نەڤێت ئەز چو سیرا سپی کەم و رویس طازی کەم چنکو تفا سەر ئەڤرازە هەر دێ وەرهیت سەرو چاڤێت مرۆڤی بەلێ پا کاخ ب خوە یا گازی دکەت و ناهێت پەردەپۆش کرنێ هەر دێ ژبن پەردێ دەرکەڤیت.

جارەکادی ئەز گازی دکەم رەوشەنبیرێ کورد کو دەستا هەلدەت ئو ل جهێ خوە پەیڤێن هەی کوم کەت داکو ئەزمانێ خوە ساخ کەین، دویماهیێ ب خاترا هەوە خودێ لگەل وە بیت بژین ب شاهی وسەرفەرازی.

پاشی کو من ئەڤ پێش گۆتنە نڤێسی سەیدا رەشۆ زیلان ئەز ئاگەهدار کرم کو ئەنستیتیۆیا کوردی ل پاریسێ لبەرە ل سالا ١٩٩٤ ڤان پەیڤێت کرمانجی چاپ بکەت. ئەڤ مزگینیە جهێ دل خوەشییا من و هەمی هەڤالێت رەوشەنبیرێت کرمانج بو ل دەڤەرا بەهدینا ژبەر ڤێ خزمەتا پاک نیشانا سەرفەرازیێ و سەربلندابیا هەمی رۆناکبیرێت

کوردە ژبەر بزاڤا ئەو ل ئەوروپای دکەت هیڤیدارین چەرخا بزاڤا وێ رۆژ ب رۆژێ گەش و بەرفرە هتر ببیت.

من مافێ چاپ و بەلاڤ کرنا ڤان پەیڤێت کرمانجی دا ئەنستیتیوێ دگەل سوپاسی و رێزێت من بۆ سەیدا کەندالی و هەمی دەستەکا هەڤالێت وی ل ئەنستیتیۆ یا کوردی ل پاریسێ.

**طه مظهر مایی ـ دهوک**
**١٩٩٣/٥/٢٥**

**تێبینی:**

ئینستیتۆیا پاریسێ فەرهەنگ چاپ نەکر و ل خودانی ڤەگەراند. بەری دو سالان کورێ رەحمەتی کاک ئەحمەد تەها مایی فەرهەنگ ئینا دەڤ مە و مە ژی وەک یەکەمین دەزگەه دا چاپکرنێ.

**مؤید طیب**
**رێڤەبەرێ وەشانخانەیا سپیرێز**
**٢٠٠٩/١/١١**

# ئا

# A

**ئا** : ئالاڤێ گازی کرنێ یه. وهک ئابرا

اداه نداء: يا ايها

**A:** Alavê gazî kirnê ye, wek a bira.

**ئا** : ئالاڤێ جابدانێ یه، وهک بهلێ. هەرێ. ئێ

اداه جواب = اجل، نعم، بلى

**A:** Alavê cabdanêye, wek: belê. herê.

**ئا** :وهک، ژنکا. دایکا من. دهسمالکا من

فى اخر اللفظ: اداه تانيث

**A:** wek. jinka. dayka min. desmalkamin.

**ئا**: وهک : زانا. شەهرەزا

فى اخر اللفظ: يحوله الى فاعل

**A:** wek.zana.şehreza.

**ئا**: وهک ڤان مروڤا

فى اخر الفظ، اداه للجمع

**A:** wek van mirova.

**ئا ئا**: جاب دان بو بنه جهـ کرنێ

اداه تأكيد الجواب: نعم، نعم

**A:** cabdan bo bine cih kirnê.

**ئابک = ئابێک**: مێزەر. بەرمالک پەردەکە ژن دەخل ودان

السماط، غطاء ينشر عليه الحبوب والغلال

**Abik = Abêk**: Mêzer. ber malk perdekejin dexludan u dirametî li ser paqij diken.

**ئابور**: ڤەگر. دەست لێ راگرتن. نەزعێ کرن. قایدە خەرج کرن

القصد فى المال، عدم البدد والتبذير

**Abor**: Vegir dest lê ragirtin. nezeî kirin qaîde xerc kirin.

**ئابور بون**: قایدە بون. خەرج کرن بقایدە: ڤەگر

التقصد، الاقتصاد

**Aborbûn**: Qaydebon. xerc kirin.biqayde: vegir.

**ئابور بوی**: ڤەگرتی: قایدە بوی. : مالێ خەرج بوی

المقتصد

**Aborbûy**: Vegirtî: qayde bûy: malê xercboy.

**ئابور تر**: قایدە تر: ڤەگرتی تر. پتر دەست لێ راگرتن

الاقصد

**Abortir**: Qaydetir: vegirtir. pitir dest lê ragirtin.

**ئابور پارێز**: بەرپرسێ ئابورێ: راگرێ ئابورێ

حامى الاقتصاد، وزير الاقتصاد

**Abor parêz**: Ber pirsê aborê: ragirê aborê.

**ئابور پارێزی**: پارازتنا ئابورێ. ئابور ڤەرگرتن

حمايه الاقتصاد

**Abor parêzî**: Paraztina aborê. uabor vergirtin.

**ئابور زان**: زانایێ ڤەکرنا ئابورێ

عالم الاقتصاد

**Abor zan** :Zanayê vegira aborê.

**ئابور زانین**: زانانینا ڤەکرن و ئابورێ

الخبره الاقتصاديه

**Abor zanîn** :Zanaîna vegir u aborê.

**ئابور زانی**: شارەزاتییا ئابورێ

عأم الاقتصاد

**Abor zanî** :Şarezatîya aborê.

**ئابور رستن**: زێدەبونا ئابورێ

النمو الاقتصادى

**Abor ristin** :Zêdebona aborê.

**ئابور رساندن**: زێدەکرنا ئابورێ دەست لێ راگرتنێ

التنميه الاقتصادى

**Abor risandin** : Zêdekirna aborê dest lê ragirtinê.

**ئابور چرچون**: تێک چونا ئابوری. ئابور تێک چون
الانكماش الاقتصادى
**Abor çirçon**: têk çona aborî. abor têk çon.

**ئابور كرن**: ڤەگرتن. دەست لێ راگرتنا ئابورێ
التقصيد، الاعتدال الصرفى الاقتصاد
**Aborkirin**: Vegirtin. dest lê ragirtina aborê.

**ئابور كرى**: ڤەكرنا ئابورا هاتى كرن وبورى
المقصد
**aborkirî**: Vegira abora hatî kirin u borî.

**ئابور كەرى**: هونەرا ئابورى وڤەگریێ
فن الاقتصاد
**Aborkerî**: Honera aborî u vegiryê.

**ئابور كەر**: كەسێ ئابورێ دكەت وپێ رادبیت
المقتصد، القاصد
**Abor ker**: Kesê aborê di ket u pêradbît.

**ئابور كارى**: كریارا ئابوریێ
العمليه الاقتصاديه
**Abor karî**: Kiryara aborî.

**ئابور كار**: شارەزایێ ئابورى
الخبير الاقتصادى، الاخصائى الاقتصادى
**Abor kar**: Şarezayê aborî.

**ئابور ناس**: شارەزایێ ئابورى
الخبير الاقتصادى
**Abor nas**: Şarezayê abborî.

**ئابور ناسى**: شارەزاهییا ئابوریێ
الخبره الاقتصاديه
**Abor nas**: Şarezahîyê aborîyê.

**ئابونه**: ناڤ كرنا بچویكێت ڤەلا لدێرێ ودهن كرنا لەشێ وان
التعميد، للنصارى
**Abone**: Navkirna biçûkêt fela lidêrê u dihin kirrna leşê wan.

**ئابونه بون**: ناڤبون ودهن بونا ساڤاییت ڤەلا لدێرێ
التعمد
**Abonbûn**: Navbon u dihin bona savayêt fela lidêrê

**ئابونه بوى**: ئەو بچویكێ ساڤا یێ هاتى ئابونه كرن لدێرێ
المعمد
**Abonebûy**: Ew biçûkê sava yê nav u dihin boy lidêrê

**ئابونه تر**: پتر كرنا ئابونەیێ
الاعمد
**Abone tir**: Pitirkirna aboneyê.

**ئابونه كرن**: پێ رابونا دهن كرنا ساڤا لدێرێ
التعميد، الاعماد
**Abonekirin**: Pêrabona dihin kirna sava lidêrê.

**ئابونه كرى**: ئەو بچویكێ ساڤا یێ هاتى ئابونه كرن لدێرێ
المعمد
**Abonekirî**: Ew biçûkê sava yê hatî abone kirin lidêrê.

**ئابونه**:
باگوهورك
الاشتراك، المشاركه، المساهمه، بدل الاشتراك
**Abone**: Baguhurk.

**ئاتاف**: قەدا بەلا مەزن. قەومینا بەد وبەش بسەرهاتیا دژوار وتیژ
البجر، الافه، النكبه، البلاء
**Ataf**: qeda. bela mezin. qewmîna bed u beş biserhatya dijwar u tîj.

**ئاتاف بون**: تێوەربونا بەلا وبەدیێ
التبجر، التنكب، الابتلاء
**Atafbûn**: Têwerbona bela u bediyê.

**ئاتاف بوى**: كەسێ بەلا گران بسەردا هاتى
المبجر، المبتلى، المنكوب
**Atafbûy**: Kesê bela giran biserda hatî.

**ئاتاف كرن**: كەسێ بەلا بسەردا ئینای
الابجار، الابلاء، التنكيل، التنكيب
**Atafkirin**: Bela giran biserda înan: Înana belayê bi egerekê.

**ئاتاف كرى**: كەسێ بەلا بسەر دا ئینای
المبجر، المنكب، المبلى
**Atafkirî**: Kesêbela biserda înay.

**ئاتافى = ئاتافیاتى**: بەداتى. بەشى. بەلا
البجران، البلاء، النكال
**Atafî =Atafyatî**: Bedatî. beşî. bela

**ئاجز**: كەربین، ئێخسیر. قەهرى. خەمبار. پندڤى
الغاضب، الغائظ، الحزين
**Aciz**: Kerbîn. êciz. qehrî. xembar. pindivî

**ئاجز بون**: کەرب ڤەبون. قەهرین. خەمبار بون. پندڤین
التغیظ ، التغضب، التحزن
**Acizbûn**: Kerb vebon. qehrîn xembarbon. pindivî

**ئاجز بوی**: ئەو کەسێ قەهری وپندڤی وکەرب ڤەبوی
المتغیظ، المغضب، المحزن
**Acizbûy**: Ew kesê qehrî u pindvî u kerb veboy.

**ئاجز تر**: کەربین تر. بندڤی تر. خەم گیر تر. قەهری تر
الاغضب، الاغیظ، الاحزن
**Aciztir**: Kerbîntir. bndvitir. xemgîrtir. qehrîtir.

**ئاجز کرن**: قەهراندن. پندڤاندن. کەربین کرن. خەم گیر کرن
الاغضاب، الاغاظه، الاحزان، التحزین
**Acizkirin**: qehrandin. pinivandin. kerbînkirin. xemgîrkirin.

**ئاجز کری**: کەسێ قەهراندی. کەسێ کەرب گرتی کر. پندڤاندی
المغضب، المغیظ، المحزن
**Acizkirî**: kesê qehrandî. kesê kerb girtî. pindivandî.

**ئاجزی = ئاجزیاتی**: پندڤین. کەرب. خەم گیری. قەهرین
الغضب، الغیض، الحزن
**Acizî =Acizyatî**: pindivîn. kerib. xemgîrî. qehrîn.

**ئاخ**: نالین. ئاخینک
الاهه، الانه، التنهد، التأوه
**Ax**: nalên. axînk

**ئاخ**: گل. خاک. ئەرد
التراب، الارض، الملک
**Ax**: Gil. xak. erd

**ئاخ بان**: خانیێ نوی ئاڤاکری بانێ وی ئاخێ دکەنە سەر ئان وەرگێرانا کوژیرە وکاشخابکێ خانی
الغموة
**Ax ban**: xanîyê nû avakirî banê wî axê dikene ser an wergêrana kojîre u kaşxabkê xanî

**ئاخ بان بون**: خانیێ ئاخ لبانێ وی هاتی کرن
الانغماء
**Ax banbûn**: xanîyê ax libanê wî hatî kirin.

**ئاخ بان بوی**: خانیێ ئاخ بان بوی
المغموە
**Ax banbûy**: xanîyê ax banbûy.

**ئاخ بان تر**:پتر ئاخکرنا سەربانی
الاغمی
**Ax bantir**:pirir ax kirna serbanî.

**ئاخ بان کرن**: کارێ کرنا ئاخە بانێ
الاغماء، التغمیە
**Ax bankirin**: karêkirna axe banê.

**ئاخ بان کری**: ئەو بانە یێ هاتی ئاخ لێ کرن
المغماه، المغموه
**Ax bankirî**: ew bane yê hatî ax lê kirî.

**ئاخ بارین**: غومام. غولپەلێل. باگەر. ئەو ئاخە یازڤستانێ لسەر بەفرێ دباریت
الغمام، الاغبرار، زوبعه، الغبار
**Axbarîn**: xumam. xulpelêl. bager. ew axe ya zivistanê liser befrê di barît.

**ئاخ بشفین**: بهوژینا ئاخا کومتل. بەلاڤ بونا ئاخێ وپەلخیناوێ
تحلل التراب، اضمحلال التربه
**Ax bişfîn**: bihojîna axa komtil. belav buna axê u pelixîna wê.

**ئاخ بشفتن**: بهوژین وپەلخینا ئاخا کومتل ودرک
انحلال التربه
**Ax bişftin**: bihojîn u pelixîna axa komtil u dirk.

**ئاخ بشێڤ**: ئامورێ ئاخ پەلخاندن وبهوژاندنێ. مروڤێ ئاخێ ببهوژینیت وبپەلخینیت
محلل التربه
**Ax** bişêv: amorêax pelixandin u bihujandinê. mirovê axê bipelixînît.

**ئاخ بشێڤی**: بهوژاند وپەلخاندن ئاخێ تەخلیتێ وێ
تحلیل التربه، الخبره التحلیه للتراب
**Ax**: bişêvî: bihujandin u pelixandina axê bo zanîna texlîtê wê.

**ئاخا بەزی**: ئاخا لێواز گەلەک هاتی چاندن ئێدی چو تشتێ شین نەکەت. ئاخا لێواز
التراب البور، التراب الضعیف غیر غصب للزرع
**Axa bezî**: axa lêwaz gelek hatî çandin êdî çi tiştî şîn neket axa lêwaz

**ئاخا بەزین**: لێواز بونا ئاخێ یە ژبەر گەلەک چاندنێ
ضعف التراب
**Ax bezîn**: lêwaz bona axêye ji ber gelek çandinê.

**ئاخ پێرادان:** هونین. کوتنه کرن. تێدا دیوار وناڤ خانی بئاخا ریچ وتەقن

السيع بالتراب ، الطلي بالترب

**Ax Pêradan**: hunîn. kutne kirin. têda dîwar u nav xanî bi axa rîç u teqin

**ئاخ پێـرا کـرن:** بەلاڤ کـرنا ریچێ یە لدیوارا وناڤ خـانی بو ڤەهوسین وهونینێ ئوتیل کرنێ

التسيع الترابي، الطلي الترابي

**Axpêrakirin** : belav kirina riçêye lidîwar u nav xanî bu vehusîn u hunînê utîl kirnê

**ئاخ پێرادوک:** ئەو کەسێ ئاخێ بخانی رادەت وکوتنه دکەت

المسيع، السياع بالتراب

**Ax pêradok**: ew kesê axê bixanî radidet u kotane di ket

**ئاخا پش:** ئاخا خاڤ: ئاخا سست و پیت

التراب، الهش، الرخو

**Ax piş**: axa xav. axa sist u pît.

**ئاخا پشی:** ئەو ئەردێ ئاخا وی پیت وسست بیت

هشاشه التراب، رخوه التربه

**Ax pişî**: ew erdê axa wî pît u sist bît.

**ئاخ پیتک:** ئاخ سست و خاڤ چوشین نەکەت

التراب السبخه، الهش

**Ax pîtik**: axa sist u xav çi şîn neket.

**ئاخ پیڤان:** ئەرد پیڤانبوزانینا بەنگهاوی

مسح الارض

**Ax pîvan**: erd pîvan bu zanîna benghawî.

**ئاخ پیڤ:** ئەو کەسێ ئەردی دپیڤیت کانێ بەنگها چەند

مساح الارض

**Axpîv**: Ew kesê erdî dipîvît kanê bengha çend.

**ئاخ پولک:** ئاخا سست وڤەکولای مروڤ لێ دادچیت

التراب المحفور المفتت

Ax polk: Axa sist u vekolay mirov têda diçît.

**ئاخا تەحسوک:** ئاخا لچ و ڤیچ وهەری وکور وتەقن مروڤ لێ دحولیسیت

الطين الزلق

**Axa tehsok:** Axa lic u vîç u herî u kurr u teqin mirov lê dihulisît.



**ئاخا تەحسین:** ئاخ ژبنێ چون. ئاخ خشان . ئاخ حولیسین

انزلاق التربه

**Axtehsîn**: Axjbin çon . ax xişan. ax hulîsîn

**ئاخ تەرقین:** ئاخ گفشین. ئاخ هەرقین. ئاخ دەوسین

انكباس التربه

**Axteriqîn**: Axa givişîn . ax herqîn. ax dewisîn

**ئاخا تەرقی:** ئاخا گفشی. ئاخا هەرقی. دەوسی

التراب المكبوس، التراب المضغوط

**Axa terqî**: Axa givişî. axa heriqî. axa dewisî

**ئاخ تەرقـاندن:** گـڤـاشـتن. هەرقـاندن. ئاخـا ڤـەقـوتان. ئاخـا درەوساندن

اكباس التراب

**Axteriqandin**: givaştin. heriqandin. axa vequtan. axa drewisandin

**ئاخ تەرقاندی:** ئاخا گڤاشتی. ئاخا هەرقاندن. ئاخاڤەقوتان. ئاخا درەوساندی

التراب المكبس

**Axteriqandî**: Axa givaştî.axa heriqandî. axa veqùtaî. axa drewisandî

**ئاخا تەراقە:** جهێ ئاخا وی پێ لێنای هاتی گڤاشتن. ئاخا پێ قوت لێ کری

التراب الكابس

**Axa teraqe**: Cihê axa wî pêlênay hatî givaştin axa pêqut lê kirî.

**ئاخا تەرێق:** ئاخا ڤەقوتک. ئاخا گفشوک

كباسه التربه، الكابسه

**Axa terêq**: Axa vequtk. axa givuşk.

**ئاخ تووز:** ئاخا تەمبلێر وغولپەلێل کێخمیتەالصعید، الغبار

**Ax toz:** Axa tembilêr u xulpelêl. kêxmîte.

**ئاخ داچون:** ئاخ قولپین. ئاخ داهاتن. ئاخ نهژتن

الهور، الهبط للتراب ، هبوط الارض

**Ax daçon**: Axqulpîn. ax dahatin. ax nihijtin.

**ئاخ رادانا سەر:** بن ئاخ کرن. ئاخ کرنا سەر. ڤەشارتنا بئاخێ

الهيل

**Ax radana ser**: Bin ax kirin. ax kirna ser. veşartina bi axê.

**ئاخ رستاندن**: شهکرنا ئاخێ. اخلّ . تەرکرنا ئاخێ
ترطيب التراب، سقى الارض للحرث

**Axribistandin**: Şihkirna axê . terkirna axê.

**ئاخ ربسین**: تەربونا ئاخێ. شهگرتنا ئاخێ
ترطيب التراب

**Ax ribisîn**: Terrbona axê. şihgirtina axê.

**ئاخ رباسه**: ئاخا تەر. ئاخا شهگرتی . نەیا زهاو هشک
الثرى

**Ax ribese**: Axa ter. axa şihgirtî. neya zuha u hişk.

**ئاخ رەش**: ئاخا رەنگێ وێ یا رەش
الحمأ، المدقع، المعدم التراب الاسود

**Ax reş**: Axa rengê wê ya reş.

**ئاخ ریخک**: ئاخا قەسری وجەمەدێ بەردای. ئاخا ریچ. هەریا روهن وخاڤ
الردغه الهشه

**Ax rîxk**: Axa qesrî u cemedê berday. axa rîç. herya rohn u xav.

**ئاخ زەر**: ئاخا رەنگ زەر. گل زەر
التربه الصفراء، التراب الاصفر

**Ax zer**: Axa reng zer. gil zer.

**ئاخ سوور**: گل سوور. ئاخا رەنگ سوور
المشغ، المغر، الهرد، المشق، الصحر

**Ax sor**: Gil sor. Axa reng sor.

**ئاخ سووی**: جهێ ئاخ سور ودەشت
الصحره، الصحراء

**Ax sû**: Cihê ax sor u deşt.

**ئاخا سەرا**: ئاخەکا قیچە. ژن سەرێ خو پێ دشون دا پرچێ سەرێ وان نەرم وحولی ببیت
الغضاره

**Axa sera**: Axeka qîçe. jin serê xo pê dişon pirçê serê wan nerm u hulî bibît.

**ئاخ سپیک**:گلێ رەنگ کەژ و سپی
الحوارى، التراب الابيض

**Ax spîk**: Gilê reng kej u spî.

**ئاخا سویر**: ئاخا بخوێ: ئاخا چوشین نەکەت وچو لێ نەرسیت
السبخه

**Ax sûrk**: Axa bixwê: axa çi şîn neket u çi lê nerisît.





**ئاخ شێرک**: مێشەکا وەکی مێروویێ یە یابپەڕ . ئاخێ دکەت بلویلک بو پەرچڤتن وباخوینێ
حشره طياره كالنمل اكبر منه

**Ax şêrk**: Mêşûka uekî mêroyê ye ya bi pereaxê di ket bilûlk bo xerzê xwê . ew ax dermane bo perciftin u baxenê.

**ئاخ شین**: ئاخا رەنگ وی شین. گل شین
التراب الازرق

**Ax şîn**: Axa reng wî şîn. gil şîn.

**ئاخفتن** : زمان گوتن. بێژین
الكلام، الحديث، اللغه

**Axiftin**: Ziman gotin. bêjîn.

**ئاخافتن**: لگەل کەسەکێ گوتن وسوحبەت کرن
الكلام مع الغير، المخاطبه

**Axaftin**: ligel kesekê gotin u suhbetkirin.

**ئاخێڤ**: ئەو مروڤێ دئاخفیت
الخطيب، المتكلم، المتحدث

**Axêv**: Ew mirovê di axivît.

**ئاخفتنا شەلەولە**: ئاخفتنا بێ سەر وبن. ئاخفتنا بێ بنیات
الهراء، الهذيان

**Axiftina şelewle**: Axiftina bê ser u bin. axiftina bê binyat.

**ئاخفتنا قاچین**: ئاخا لچ وەکی قاچکی. ئاخا پێکفه رستی
المدر، البراق، اللزب، العلك

**Axa qaçîn**: Axa liç wekî qaçkî.

**ئاخا قیچ**: ئاخا برقوک وبرسکی وتەیسوک وەک شویشەی
المدر ، البراق

**Axa qîç**: Axa birqok u biriskî u teysok wek şûşey.

**ئاخا کوڕ**: ئاخا تەقن. ئاخا هەڕی
الوحل

**Axa korr**: Axa teqin. axa herrî

**ئاخا کیز**: ئاخا تێکەل خیز. خیزێ هویر وەکی خیزێ بەرو رووبارا
الودع، المهرقان

**Axa kîz**: Axa têkel xîz xîzê hûr wek xîzê ber rûbara.

ئا A

**ئاخا كويڤى**: ئاخا دەشت ڤەداى. ئاخا شـول تێ نەكرى ئاخا نوى بها يانەهاتى چاندن

الارض البكر غير المستثمر

**Axa kûvî**: Axa ne dest veday axa şol tê nekirî. axa ne biha ya ne hatî çandin.

**ئاخ لێڤك**: دويماهيكا كەلشتنا لێڤانە

الشدق، ج: اشداق

**Ax lêvk**: Dûmahîka keliştina lêvane.

**ئاخ لێڤە، ئاخ لڤ**: سەرێ بها . دەمێ هەلدانا گييا وشينكاتييا . لڤينا ئاخێ. ببەر بەركێ بهارێ

الادباس، الرشم، باكوره

**Ax lêve**: serê biharê demê heldana gîya u şînkatîya livîna axê. berberkê biharê.

**ئاخ لڤين**: سەرێ بهارێ يە دەمى شين بونا گل و وگييا

اول الربيع، موسم الضماء

**Ax livîn:** Serê biharêye demê şînbona gil u gîya.

**ئاخ مرى**: ئاخا پش ولێواز چولێ شين نەبيت ئو لێ نەرسيت. بكێر چاندنێ نەهێت

البور، السبخه، تراب غير غصب

**Ax mirî**: Axa piş u lêwaza ço lê şîn nebît u lê nerrisît. bi kêr çandinê nehêt.

**ئاخ هەلاڤـێتن**: بلند بونا ئاخێ يەوەك سـيـڤـوك ژبەر هەلاڤـێـتنا مشكى يان هەلدانا گييا وەكى گووێ يێ بهێت

القمع، الفئير

**Ax helavêtin**: Bilind bona axêye wek sîvokê jiber helavêtina mişkî yan heldana giyay wekî gowê yê bihêt.

**ئاخوير**: گوڤ. هەل. كول. ئەختە خانە. خانيێ پەزو حيوانا

الاصطبل

**Axur**: Gov. hel. kol. exte xane. xaniyê pez u hêwana.

ئاخويرك: تەخليتەكێ پشويێت هويرە

القرس، صغار البق، الناموسيه

**Axûrk**: Texlîtekê pêşoyêt hwîre.

**ئاخ خيز**: ئاخا خيز تێكەل

الرغام

**Ax xîz**: Axa xîz têkel.

**ئاخنين**: تژى كرن. رەپژاندن. داگرتن

الحشو، الشحن، العبء

**Axinîn**: Tijî kirin. repijandin. dagirtin.

**ئاخفتين**: گوتن. زمان. پێژاندن

الكلام، النطق، الحديث

**Axiftin**: Gutin . ziman. bêjandin.

**ئاخفتن بێژ**: گوتو. گوتن كەر

القائل

**Axiftin bêj**: Gutu . gutinker.

**ئاخفتن كەر**: گوتن بێژ

المتحدث

**Axiftin ker**: Gutin bêj.

**ئاخفتن بون**: گوفت وگو

التحدث، المحادثه، الكالمه، التكلم

**Axiftin bon**: Guft u go.

**ئاخفتن كرن**: گوتن كرن

المكالمه

**Axiftin kirin**: Gutinkirin.

**ئاخفتن بەلاڤى**: ئاخفتنا نەڤێك كەتى. ئاخفتنا پرەپويچ

الهذيان، الهراء

**Axiftin belavî**: Axiftina nevêk ketî. axiftina pirepûç.

**ئاخفتن بەدى**: رەش بينى . بەد بينى. بەد گوتن. بەد بێژى

المتشائم

**Axiftina bedî**: Reşbînî. bed bînî. bed gotin. bed bêjî.

**ئاخفتن بەد**:مروڤێ رەش بينى. كەسێ بەد گو

التشاؤم

**Axiftina bed**: Mirovê reşbîn. kesê bed go.

**ئاخفتنا بێ سەر وبن**: گوتنا بێ دويماهى ودرەو

الكلام المضطرب المشوش كلام لااول له ولا اخر

**Axiftina bê seruber**: Gutina bê dûmahî u direw.

ئاخفتنا بسەر وبەر: ئاخفتنا رێك وپێك. ئاخفتنا پێك هاتى . ئاخفتنا بسەروبەر

الكلام المرتب

**Axiftina biseruber**: Axiftina rêk u pêk. axiftina biseruber.

**ئاخفتنا بادل هەوا**: بەلاڤ ئاخفتن

الكلام الباطل، لغو الحديث

**Axiftina badilhewa**: Belavaxiftin.

**ئاخفتنا ببها**: گوتنا بنرخ

الكلام القيم

**Axiftina bibiha**: Gutina binerix.

**ئاخفتنا بێ بها**: ئاخفتنا بێ نەرخ

الكلام الرخيص

**Axiftina bêbiha**: Gutina bê nirix.

**ئاخفتنا بن جه**: ئاخفتنا موکوم وبەرکەتی یادجهێ خوەدا

الكلام الثابت الرصين

**Axiftina bincih**: Axiftina mukum u berketî ya di cihê xweda.

**ئاخفتنا بوڕ**: ئاخفتنا بلندو ستوير

الكلام الجهوري

**Axiftina borr**: Axiftina bilind u stûr.

**ئاخفتنا بەلافش**: ئاخفتنا چڤێل وپویچ. ئاخفتنا نەڕێ

الكلام الفاحش البذيء

**Axiftina belafiş**: Axiftina çivêl u pûç. axiftina nerrê.

**ئاخفتنا بەرکەتی**: ئاخفتنا بنە جه وبکێرهاتی

الكلام القيم

**Axiftina berrkeftiî**: Axiftina binecih u bikêrhatî.

**ئاخفتنا پێک هاتی**: ئاخفتنابسەروبەر. ئاخفتنا ڕێک وپێک

الكلام المرتب، الحديث المنمق

**Axiftina pêkhatî**: Axiftinabiser u ber . axiftina rêk u pêk

**ئاخفتنا تەزی**: ئاخفتنادل شکێن. ئاخفتنا دل سار

القدح، الكلام القادح

**Axiftina tezî**: Axiftina dil şikên. axiftina dil sar.

**ئاخفتنا تەزی**:کەسێ گوتن سار. کەسێ ئاخفتن دل شکێن

القادح

**Axiftina tezî**: Kesê gutin sar. kesê axiftin dil şikên.

**ئاخفتنا تێکەل**:پێکڤە لگەلک ئاخفتن

الهمرجه، الكلام المختلط

**Axiftina têkel**:Pêkve ligelêk axiftin.



**ئاخفتنا تیر**: ئاخفتنا بزوکا وپڕ مەعنا

الكلام المركز ، الحديث المركز، الحديث المكثف

**Axiftina tîr**: Axiftina bizoka u pirr mana.

**ئاخفتنا تێر**: ئاخفتنا کورت وپڕ مەعنا

الكلام المشبع

**Axiftina têr**: Axiftina kurt u pirr mana.

**ئاخفتنا بتیڤل**: ئاخفتنا نەکامی. گوتنا بطەعن وتیڤل

الكلام المطعون، الحديث الموجع

**Axiftina bitîvil**: Axiftina nekamî. gutina bitan u tîvil.

**ئاخفتنا چڤێل**: ئاخفتنا بەلافشی وپویچ وتام سار

الشطط الكلامي

**Axiftina çivêl**: Axiftinabelafişî u piûîç u tam sar.

**ئاخفتنا چەپەلی**: ئاخفتنا نەڕێ. پویچ وبەلافشی

الكلام الفاحش

**Axiftina çepelî**: Axiftina nerê. piwîç u belafişî.

**ئاخفتنا گەرهان**: بەلاڤ بونا ئاخفتنێ لناڤ خەلکی

التواتر، الشائعه، الاذاعه

**Axiftina gerhan**: Belav buna axiftinê linav xelkî.

**ئاخفتنا گێر**: کەسێ ئاخفتنا بەلاڤ دکەت وڤەدگوهێزیت ئاخفتن ڤەگوهێز

المذيع

**Axiftina gêr**: kesê axiftinê belav diket u vedguhêzît. axiftin veguhêz.

**ئاخفتنا همبزی**: ئاخفتنا کورت وتژی مەعنا

الحديث الكثف، الكلام المركز

**Axiftina himbizî**: Axiftina kurt u tijî mana.

**ئاخفتنا ساری**: ئاخفتنا دل ئێش ودل شکێن

الكلام الساخر، القدح

**Axiftina sarî**: Axiftina dil êş u dil şikên.

**ئاخفتنا شەمرین**: بێ دەنگ بون. مت بون. ئاخفتن هێلان. کەڕبونا ئاخفتنێ

السكوت، الصمت. ترک الحديث

**Axiftina şemirîn**: Bêdeng bûn. mit bûn. axiftin hêlan. kerr buna axiftinê.

**ئاخفتنا ڤەچوپرین**: بێ دەنگ بونا ئاخفتنێ. مت بون. کەڕ بون. هێلان
السکوت، ترکَ الکلام، الصمت
**Axiftina veçoprîn**: Bêdeng buna riyê axiftinê. mit bûn. kerrbûn. hêlan.

**ئاخفتنا ڤەدان**: دەنگ ڤەدان . جاب ڤەدان. ئاخفتن ڤەگێران
الصدى، الرد
**Axiftina vedan**: Deng vedan cab vedan. axiftin vegêran.

**ئاخفتنا ڤەهاندن**: ئاخفتن لێک . ئاخفتنا لێک ئینای
نظم الكلام، نضد الكلام، الشعر، قرض الشعر
**Axiftina vehandin**: Axiftin lêk înan. axiftin lêk înay.

**ئاخر و ماخر**: تشت ومشت، هویر ومویر. پشت گوڕێ مالێ
الادوات، الاغراض، الامتعه
**Axir maxir**: tişt u mişt. hûrumûr. pişt gurrê malê.

**ئاخ ماخی**: گوهشین. باژێله بونا هزرێ . پێ نەحەسان
الغفله، البلاهه، الغباء، الجهل، البلاده
**Ax maxî**: Guhişîn. bajêle buna hizrê. pênehesan.

**ئاخفتن ژەنین**: لێک ئینانا ئاخفتنا باش وسپەهی وبەرکەتی . سپەهی ئاخفتن
صوغ الكلام
**Axiftin** jenîn: lêk înana axiftina baş u sipehî u berketî. sipehî axiftin.

**ئاخین**: جهێ تێر بئاخ وگل. تشتێ ئاخێ چێکری
الترابی
**Axîn**: Cihê têr bi ax u gil . tiştê ji axê çêkirî.

**ئاخینک، ئاخێنک**: نالێن. بێهن راهێلانا بخەم وکوڤان. بێهن راهێلانا پوسیده وبخەم
التنهد، التأوه، الانه، الاهه
**Axînk= axênk**: Nalên: bêhin rahêlana bixem u kuvan. bêhin rahêlana pusîde u bixem.

**ئاخر**: ڤێجا ڤجا
اذن
**Axir**: Vêca êvca.

**ئاخ وداخ**: کول وکوڤان. گرێ شین. نالێن وکالێن
الانين، النحيب، الرثاء
**Ax u dax**: Kul u kuvan. girî u şîn. nalên u kalên.



**ئادا**: گازی کرنا دایکێ یە. گازی یە بو دایکێ یاام
**Ada**: gazî kirna daykêye. gazîye bo daykê.

**ئاد**: نەڤیان. پاتک دان. ژێ رەڤین. ڤەجنقین
النفره، الغضاضه
**Ad**: Neviyan. patikdan. jê revîn. vecinqîn.

**ئاد بون**: ڤەجنقین
التنفر
**Adbûn**: Veciniqîn.

**ئاد بوی**:یێ ڤەجنقی وپاتک دای
المنفور
**Adbûy**: Yê veciniqî upatik day.

ئاد تر: ڤەجنقی تر. پتر وپاتک دای
الانفر، الاغضض
**Adtir**: Veciniqî tir.pitir patik day.

**ئاد کرن**: ڤەجنقاندن. کویڤی کرن
الانفار، التنفير، التغضيض
**Adkirin**: Veciniqandin. kiûvîkirin.

**ئاد کری**: ڤەجنقاندی. پاتک دای
المنفر، المغضض
**Adkirî**: Veciniqandî. patik dayê.

**ئادیاتی**: نەڤیان. دل رەش بون. پویتە پێ نەکرن
النفره، الغضاضه
**Adyatî**: Neviyan. dil rreşbûn. pûte pê ne kirin.

**ئاداڤ = ئاداب**: کێم وزوخ
القيح، الصديد، الغذيذ
**Adav =Adab**:kêm u zox.

ئاداڤ گرتن: کێم گرتن
التقبح
**Adav girtin**: kêm girtin.

**ئاداڤ گرتی**: کێم گرتی و کول وپەرچفتی
المتقيح
**Adav girtî**: kêm girtî u kul u perçiftî.

**ئاداڤ دربون**: زانا کێم ژجهێ کول. کێم تێ هاتن
جريان القيح، من الجرح
**Adav derbûn**: zana kêm ji cihê kul. kêm tê hatin.

A ئا

**ئاداڤ دەرکرن**: ڤەکرنا جهێ کول و پەرجفتی داکێم زوخ ژێ بهێن ودەرکەڤن

فتح الجرح لخروج الصديد

**Adav derkirin**: Vekirna cihê kul u perciftî da-kêm u zox jê bihên u derkevin.

**ئادافکی**: جهێ بکێم و زوخ . تشتێ رەنگێ ئاداڤێ

المتقيح، لون القيح

**Adavkî**: Cihê bikêm u zux. tiştê rengê edavê.

**ئادار = ئاڤ دار**: مەها سەرێ سالا کوردی یە. مەها سەرێ بهارێ یە. مانگا ئاڤ تێ گەرهان وشین بون هەلدانا گل و گیایە وخێڤ بونا دارو باری

شهر مارت = اذار

**Adar = Avdar**: Meha serê sala kurdîye.. meha serê biharêye av têgerhan u şînbon u heldana gil u giyaye u xêv bona dar u barî.

**ئاداروک**: کولیلکا هەیڤا ئادارێ بشکڤیت

زهره شهر اذار، صنف من الزهر تنبت فى البرارى

**Adarok**: kulîlka heyva adarê di bişkivît.

**ئادە**: پاقژ کرنا چاندنێ یە ژگیایێت زەرەر دار وخراب

تعشيب الزرع، تنظيف ، تنقيه

**Ade**: Paqij kirina çandinêye ji gîyayêt zererdar u xirab.

**ئادە بون**: ئەو چاندنا پاقژ کری ژگیایێت زیاندار

التعشب، التنظف

**Adebûn**: Ew çandina paqijkirî ji giyayêt ziyan-dar.

**ئادە بوی**: ئەو چاندنا هاتی پاقژ کرن ژدەغەلا

المعشب، المنظف

**Adebûy**: Ew çandina hatî paqijkirin ji dexela.

**ئادە کرن**:پێ رابونا پاقژ کرنا چاندنی یە ژگیایێت نەباش

التعشيب، التنظيف

**Adekirin**:Pê rabona paqijkirna çandinê ye ji-giyayêt nebaş.

**ئادە کری**:چاندنا هاتی پاقژ کرن

المعشب، المنظف

**Adekirî**: Çandina hatî paqij kirin.

**ئادە کەر**: ئەو کەسە یێ چاندنێ پاقژ دکەت ژگیایێت بزەرەر

العشاب، النظاف، المنظف

**Adeker**: Ew kese yê çandinê paqij diket ji giyayêt bizerer.

**ئادوی**: مێش وموریێت زیياندار

الحشرات الضاره

**Adû**: Mêş u murêt zyandar.

**ئادەم**: بابێ مروڤایێ بەری. پێشیێ مروڤا. ئەول کەسی پەیدابوی ومروڤ ڤدویڤ کەتی

ادم ابو البشر

**Adem**: Babê mirova yê berê. pêşîyê mirova. eûl kese peydaboy u mirov vi diûv ketîn.

**ئادەمی**: رێشت وقنێتا ئادەمی نە،روڤێ ڤدویڤ ئادەمی کەتین

البشر

**Ademî**: rrêşit u qinêta ademî ne . mirovê vidiûv ademî ketin.

**ئادونە**: **کاروخە**: مروڤێ کەلەخێ وی ژقایدەی مەستر. ئەجلاف

العملاق، الضخم الجثه

**Adone: Karuxe**: mirovê kelex û ji qaydey mes-tir eclaf. kesê gelek mezin.

**ئار**: ئورێ درامەتی. دانێ هێرای. کێخمیتە

الدقيق، الطحين

**Ar**: orê drametî. danê hêray. kêxmîte.

**ئار بێتن**: موخل کرنا ئاری

السفسفه

**Ar bêtin**: Muxil kirna arî.

**ئار بێژ**: کەسێ ئاری لموخلێ دکەت

المسفسف

**Ar bêj**: Kesê arî limuxelê diket.

**ئار توی**: تویێت هشک بهێرن. ئارێ توی یێت هشک توی یێت هێرانی وقوتای

دقيق التوت اليابس

**Ar tû**: Tiûyêt hişk bihêrin. arê tiûyêt . tiûyêt hê-ray u qutay.

**ئار خافک**: پێ خارنەکە ژئارو روینا چێدکەن بنانی دخون

اللهيده

**Ar xavk**: Pê xarneke ji ar u rûna çêdken bi nanî dixun.

**ئار دوشاڤک**: پێ خارنا ئاری تێکەل کەن لگەل دوشاڤێ
العجه، ادم من الدقيق والدبس
**Ar doşavk**: pê xarneke arî têkel ken ligel doşavê.

**ئارەزو** : پەرسوتک. گڕ. ڤییانا تیژ. خەربیا دژوار ئارونک
الشوق، الرغبه، الحنين، الوجد
**Arezo**: Persutik. girr. viyana tîj. xerîbiya dijwar. aronk.

**ئارەزو بون**: پەیدابونا گڕ وپەرسوتکێ. ڤییان کرن. داخاز کرن
الاشتياق التوجد، الترغب، التحن، التشوق
**Arezo bon**: Peyda bona girr u persutkê. viynkirin. daxwazkirin.

**ئارەزو بوی**: کەسێ پەرسوتک بەربوییێ. کەسێ گڕی گرتی
المرغب، المشتاق، الموجود
**Arezobûy**: Kesê persutik berboyê. kesê girrî girtî.

**ئارەز و تر** : پتر گڕ کرن. پتر پەرستوک تێ ئالهان
الاشوق، الارغب، الاحن
**Arezotir**: Pitirgirr kirin. pitir perstuk tê alhan.

ئارەزو کرن: گڕ کرن. خەریب کرن. ڤییان کرن. داخاز کرن
التشويق، الاشتياق، الاحنان، الترغيب
**Arezokirin**: Girr kirin xerîb kirin. viyan kirin. daxazkirin.

**ئارەزو کری**: کەسێ خەریب کری. مروڤێ گڕ کری: گڕدای
المرغب، المشوق، المحنن
**Arezo kirî**: Kesê xerîb kirî. mirovê girr kirî girrday.

**ئارەزویی = ئارەزویاتی**: گـڕ. پەرسـتـوک.خـەریبی. گـڕیـاتی. پەرستوکانی
الشوق، الحنين، الرغبه، الوجد
**Arezoyî= Arezoyatî**: Girr. perstutik. xerîbî. girryatî. perstukanî.

**ئارەزو مەند**: گەلەک خەریب: گڕدار. پەرستوک تیژ
الراغب، المشتاق
**Arezo mend**: Gelek xerîbgirrdar. persuk tîj.

**ئارەزو مەندی**: ڤییانا دژوار. پەرستوک تیژی. گڕهار.
المرام، الشوق، الرغبه
**Arezo mendî**: Viyana dijwar. persutik tîjî. girr har.

**ئارمـالک**: ئامـویرەکی ئاری ژ مـزاخـا ئاشی پێ دکێشن دەرڤە کەڤچکێ ئار ڤەک ئێخستنێ
خشبه جمع الدقيق من الرحى
**Armalk**: Amiûrekê arî ji mizaxa aşî pêdkêşin derve. kefçkê ar vêk êxistinê.

**ئار هەڤیرکرن**: ئار روهن کرنا بئاڤێ بو پەحتنێ
عجن الگحين ، العجن
**Arhevîrkirin**: Ar ruhn kirina bi avê bo pehtinê.

**ئارمەڤێتک**: پێ خارنەکە ژ ئارو هنگڤینی چێدکەن بنانی دخون
الوخيزه، الثريده، ادم من الطحين والعسل
**Ar mevêtk**: pêxarneke ji ar u hingvînî çêdken binanî dxun.

**ئارام**: بهـێن هـاتنە: تەنـابون. هێـدی بون. خـوەلبـەر گـرتن. ملپەحنی. بارکێشی
الصبر، السلوى، الراحه، السكون
**Aram**: Bêhn hatine. tena bon. hêdî bon. xiwelbergirtin. milpehnî. barkêşî.

**ئارام بون**: بهێن هـاتن. تەنابون.تەبتین. خوەلبەر گرتنا نەخوشـیێ.
التصبر، السكينهالارتياح
**Arambûn**: Bêhn hatin. tena bon. xiwelbergirtina nexoşiyê.

**ئارام بوی**: بهێن هاتی وخوەلبەر گرتی
التصبر، السكينه، الارتياح
**Arambûy**: Bêhn hatî u xiwelbergirtî.

**ئارام تر**: پتر تەنا وخوەلبەر گرتی. بێهن هاتی تر. خوەلبەرگرتی تر
الاصبر، الاسكن، الاروح
Aramtir: Pitir tena u xiwelbergirtî. bêhn hatî tir. xiwelbergirtî tir.

ئارام کرن:تەنا کرن. بهێن ئینان ژخەم و نەخوشیێ
الاصبار، التسكين، التسليه
**Aramkirin**: Tena kirin. bihên înan ji xem u nexxiwşoyê.

**ئارام کری**: بێهن ئینای. دەست ددلی دای
المسكن، المژبر، المروح
**Aramkirî**: Bêhn înay. dest didilî day

**ئارام گەه**: جهێ بهێن هـاتنێ ژبەر نەخوشـیێ
المثوى الملجأ، المستقر، المأوى. المؤمل
**Aram geh**: Cihê bêhn hatinê ji ber nexweşiyê.

**ئارام گرتن**: تەنابون. خوە گرتنا لیەر ژانێ
السکون، القرار
**Aram girtin**: tena bon. xweragirtina liber janê.

**ئارام گری**: خوەلبەرگری. تەنابونی
الاستقرار، السکینه، الاصطبار
**Aram girî**: Xwelbergirî. tenabonî.

**ئارام گرتی**: خوە لبەرگرتی تەنابوی. بهێن هاتی
الصبور، الصابر، المرتاح
**Aram girtî**: Xwelbergirtî. tenaboy. bêhn hatî.

**ئارمانج**: نیشان: تشتێ مروڤی دڤێت بگهیتێ. داخاز گە
الهدف، الغایه، القصد، الغرض، المرام
**Armanc**: Nîşan. tiştê mirovî divêt bigehîtê. daxazgih.

**ئارمانج خاز**: کەسێ بخازیت بگەهیت ئارمانجێ. داخازا خوە بجە بینیت
المهدف، طالب الهدف، المبتغی، المقصد، القاصد، المغرض
**Armanc xaz**: Kesê dixazît bigehît armancê. daxaza xwe bicih bînît.

**ئارمانج خازتن**: ڤیانا گهشتنا ئارمج و داخازی
طالب الغایه، المقصود، الاستهداف
**Armanc xaztin**: Viyana gehiştina armanc u daxazî.

**ئارمانج خازی**: ڤیانا گهشتنا ئارمانجا خوە
نشدان الغایه، مطالبه الهدف
**Armanc xaztin**: Viyana gehiştina armanca xwe.

**ئارمانج دیاری**: ئارمانجا بەلیاتی. ئارمانج خوەیاس. ئارمانج کفشی. ئاشکرایی
وضوح الهدف
**Armanc dîyarî**: Armanca beliyatî. armanc xwey. armanc kifşî. aşkirayî.

**ئارمانج دیار بون**: ئارمانج کفش بون. ئارمانج ئاشکرا بون. ئارمانج روهن بون
توضح الهدف
**Armanc dîyarbûn**: Armanc kifşbûn. armanc aşkirabûn. armanc rohnbûn.

**ئارمانج دیار کری**:ئارمانج ئاشکرا کرن. کفش بون. بەلی کرن. خوەیا کرن. روهن بون
توضیح الهدف
**Armanc dîyarbûn**: Armanc kifşbûn. armanc aşkirabûn. armanc rohnbûn.

**ئارمانج شکاندن**: گهاندنا ئارمانجێ. ڤێکەتنا ئارمانجێ. گهشتنا داخازی
اصابه الهدف
**Armanc şkandin:** Gihandina armancê. vêketina armancê. gehiştina daxazê.

**ئارمانج شکێن**: کەسێ دگهیت ئارمانج و داخازا خوە
الهداف، مصیب الهدف، نیل الغایه
**Armanc şkên**: kesê digehît aramanc u daxaza xwe.

**ئارمانج گهەشتن**: گهشتنا هیڤی و داخاز وئارمانجێ
بلوغ الغایه
**Armanc giheştin**: Gehiştina hîvî u daxaz u armancê.

**ئارمانج گهاندن**: ئێک مروڤێ بگەهینیت ئارمانجێ
اناله الهدف، ایصال القصد
**Armanc gihandin**: Êk mirovî bigehînît armancê.

**ئارمانج کویری**: ئارمانج مژوکی. ئارمانج مرەولی. ئارمانج کویریاتی: ئارمانج مژوکیاتی. ئارنمانج مرەولیاتی
غموض الهدف، ابهام الغایه
**Armanc kûrî**: Armanc mijokî. armanc mijewî. armanc kûryatî. armanc mijokiyatî armanc mirewlatî.

ئارودە: نەترو. بێ خیرەت. کەیف بخوە هاتی. بخوە دای . بێ تروێش
المزهو، المفتخر، الکسول
**Arode**: Netro. bêxîret. keyf bxwe hatî. bixweday. bê tiroş.

**ئارودەیی**: بخوەدان . کەیف بخوە هاتن.. نەترویاتی ئارودەیاتی. بێ ترویشی
الافتخار.الزهو. الکسل
**Arodeyî= Arodeyatî**: Bixwedan. keyf bixwe hatin. netroyatî. bêtirûşî.

**ئارمانج دیتن**: رێک دیتنی. درست دیتنی. داخاز خوەیابون. ئارمانج روهن بون
رؤیه الهدف
**Armanc dîtin**: rêk dîtinî. dirist dîtin. daxaz xeweyabon. armanc rohn bon.

**کەڕ**: حێوانێ گوهـ بچویک، پەزێ گوهـ بچویک

(الاسک، من الغنم)

**Kerr**: Hêwanê guh biçwîk, pezê guh biçwîk.

**کەربون**: پرت پرت بون، ژێکڤەبون، پرتکین، بژکین، هویربون، کویزی بوون

(الانقسام، التقطیع، التفرق، التجزء)

**Kerbûn**: Pirt pirtbûn, jêkvebûn, pirtikîn, bijikîn, hwîrbûn, kwîzîbûn.

**کەربوی**: پرت بوی، ژێکڤەبوی، پرتکی، بژکی، هویر بوی، کویزی بوی

(المقسوم، المقطوع، المجزؤ، المفرق)

**Kerbûy**: Pirtbûy, jêkvebûy, pirtikî, bijikî, hwîrbûy, kwîzîbûy.

**کەرتر**: پرت پرت تر، بژکی تر، پرتکی تر، هویر بوی تر، کویزی تر، ژێکڤە تر

(الاجزء، الاقطع، الافرق، الاقسم)

**Kertir**: Pirt pirtir, bijikîtir, pirtikîtir, hwîrbûytir, kwîzîtir, jêkvetir.

**کەرکرن**: هویرکرن، پرتکاندن، بژکاندن، برین، ژێکڤەکرن

(التقسیم، التجزء، التقطیع، التفریق)

Kerkirin: Hwîrkirin, pirtikandin, bijikandin, birrîn, jêkvekirin.

**کەرکری**: هویرکری، پرت پرت کری، پرتکاندی، بژکاندی، ژێکڤەکری

(المجزء، المقسم، المفرق، المقطع)

**Kerkirî**: Hwîrkirî, pirt pirtkirî, pirtikandî, bijikandî, jêkvekirî.

کەرینی، کەریاتی: پرت پرتی، پرتکینی، ژێکڤەبونی

(القسم، الجزئیە، القطع، الفرقە)

**Kerînî = Kerîyatî**: Pirt pirtî, pirtikînî, jêkvebûnî.

**کەربار**: رەخێ مەخەلێ یێ ژێری، بنێ مەخەلاپەزی یێ خاری، ملێ دانگێ

(اسفل المراح للغنم)

**Kerbar**: Rexê mexelê yê jêrî, binê mexela pezî yê xarî, milê dangê.

**کەربەش**: توخمەکێ گییایە

(نبات عشبی)

**Kerbeş**: Tuxmekê gîyaye.

**کەڕبون**: گوهـ گران بون، گولێ نە بون، مت بون، هش بون، بێ دەنگ بون

(الهدۆ، السکون، الصموت، الصمم)

**Kerrbûn**: Guh giran bûn, gulê nebûn, mitbûn, hişbûn, bêdeng bûn.

**کەڕبوی**: گوهـ گران بوی، گولێ نەبوی، مت بوی، هش بوی، بێ دەنگ بوی

(الساکن، الهادئ، الصامت)

**Kerrbûy**: Guh giran bûy, gulênebûy, mitbûy, hişbûy, bêdeng bûy.

**کەڕینی، کەڕاتی**: گوهـ گرانی، گولێ نەبوی، مت بونی، هش بونی، متی، هشی، هش بونی

(الهدوء، السکون، الصمم، الطرش)

**Kerrînî = Kerratî**: Guhgiranî, gulênebûy, mitbûnî, hişbûnî, mitî, hişî, hişbûnî.

**کەرب**: کین، رک، بقز

(الغیظ، الشنئان، الحقد، الغضب، الحنق، الغیرە)

**Kerb**: Kîn, rik, biviz.

**کەربین**: کیندار، رکین، بقزویی

(الغائظ، الحاقد، الغاضب، الحانق، الغیور، الحردان)

**Kerbîn**: Kîndar, rikîn, bivizoyî.

**کەرب ڤەکرن**: کین کرن، رک کرن، بقزاندن

(الاغاظە، الاغضاب)

**Kerbvekirin**: Kînkirin, rikkirin, bivizandin.

**کەرب ڤەکری**: کین کری، رک کری، بقزاندی

(المغتاظ، المغضب)

**Kerbvekirî**: Kînkirî, rikkirî, bivizandî.

**کەرب گرتی**: کین گرتی، رکو، بقزی

(الغضبان، الحردان)

**Kerbgirtî**: Kîngirtî, riko, bivizî.

**کەرب گرتن**: کین گرتن، رک گرتن، بقزگرتن

(الحرد، الغضب)

**Kerbgirtin**: Kîngirtin, rikgirtin, bivizgirtin.

**کەرب ڤەشارتن**: رک داعویران، کین پەردەکرن

(الکظم)

**Kerbveşartin**:Rikda 'wîran, kîn perdekirin.

**کەرب ڤەشێر**: رک داعویر، کین پەنی کەر

(الکاظم)

**Kerbveşêr**:Rikda 'wîr, kîn penî ker.

**کەرتک**: ناڤ بڕ، ملک، گڤاندە
(الفاصل بين المزروعات)
**Kertik**: Navbirr, milik, givande.

**کەرتک، کنورک**: دارەکێ دوگوهە ستریا پێ هەلدگرن، دارەکێ دوچەقەلە ستریاپێ ڤەدگوهێزن
(آله خشبيه على هيئه واى الانگليزيه ينقل به الشوك على الكت)
**Kertik = Kinork**: Darekê duguhe stirya pê heldigirin, derekê du çeqele stirya pê vediguhêzin.

**کەرچوڤە**: کەتوەر، سەرسک، سەرسەری، تێ وەرینک، زڕتەک
(اللقص، الضريک، الاهوج، الابلز، المستهتر، الاثول، الطامل)
**Kerçove**: Ketwer, sersik, serserî, têwerînk, zirrtek.

**کەرچوڤەیی، کەرچوڤەیاتی**: کەتوەری، سەرسکی، بسەرسەریاتی، تێ وەرینی، زڕتەکی
(الاستهتار، الضرک، اللقص، الثول، الهوج، البلغ، الطمل)
**Kerçûveyî = Kerçûveyatî**: Ketwerî, sersikî, biserseriyatî, têwerînî, zirtekî.

**کەرچوخ**: ساکووێ شول کرنێ، ساکووێ پشتی کێشانێ
(الشودر، معطف الشغل)
**Kerçox**: Sako wê şolkirinê, sakowê piştî kêşanê.

**کەرخ**: لات، کولان
(الفارزه، خط الطريق)
**Kerx**: Lat, kolan.

**کەرخ**: لات، باق، براماشارێت چاندنێ، ناڤ برا دەپێت چاندنێ
(الخط الفاصل بين الواح المزروعات)
**Kerx**: Lat, baq, birra mişarêt çandinê, navbirra depêt çandinê.

**کەرخ**: بارستا بەردرێژ، گزرە
(الخط الطولى من الاشياء، المكدسه، المتراكبه وغيرها)
**Kerx**: Barista berdirêj, gizre.

**کەڕاخ**: چاڤدێرێ ئاڤدانا ئەردێ چاندێ
(الوراز)
**Kerrax**: Çavdêrê, avadana erdê çandinê.

**کەڕاخی**: چاڤدێریاتی، ماتیا چاندن وشینکاتی
(الورازه، مهنه الوراز)
**Kerraxî**: Çavdêrîyatî, matîya çandin û şînkatî.

**کەرخی**: کوسک بوی، وەستای، تەوخی
(النفيه، البائخ، اللاغب، الكل، الوانى)
**Kerixî**: Kuskbûy, westay, tewixî.

**کەرخین**: کوسک بون، وەستان، تەوخین
(النفه، البوخ، اللغوب، الونى، الكلاله، اللغب، شده الاعياء)
**Kerixîn**: Kuskbûn, westan, tewixîn.

**کەرخاندن**: کوسک کرن، وەستاندن، تەوخاندن
(الاغلاب، الاكلال، التنفيه، التبويخ)
**Kerixandin**: Kuskkirin, westandin, tewixandin.

**کەرخاندی**: کوسک کری، وەستاندی، تەوخاندی
(المنفه، المبوخ، الملغب، المكل)
**Kerixandî**: Kuskkirî, westandî, tewixandî.

**کەرێ ئاسنی**: پایسکل، خرخالا ئاسنی
(الدراجه الناريه، موتورسكل)
**Kerê asinî**: Paysikil, xirxala asinî.

**کەردڕ**: توخمەکێ خروبی یە، تەخلیتەکێ دانێ خارنێ یە
(الشوفان، السبط، صنف من الاذره)
**Kerdirr**: Tuxmekê xirobîye, texlîtekê danê xarnêye.

**کەرەسە**: سیبەرا تاری، سیبەرا لێکدای
(المقنأه، الوريف)
**Kerresih**: Sîbera tarî, sîbera lêkday.

**کەرصە**: بێ بها، راخویتە، تشتێ چونە
(النذل، التافه)
**Kerse**: Bêbiha, raxwîte, tiştê çune.

**کەرسل**: پوسل، سەگین
(الروث)
**Kersil**: Posil, segîn.

**کەر ئەور**: پرتا ئەوری، پنیا ئەڤری
(الطحره، الطحيه، الغسم)
**Ker ewr**: Pirta ewrî, pinya evrî.

**کەراڤ**: چیقا ئاڤێ: چیق ئاڤا بناڤ دێمی ڤەچوی
(الخليج)
**Kerav**: Çîqa avê, çîq ava binav dêmî ve çûy.

**کەرفس**: توخمەکێ گیایێ خارنێ یە، یێ بێهن وتام خوەشە
(الكرافس، نبات عشبى يؤكل، طريا ومطبوخا)
**Kerefs**: Tuxmekê gîyayê xarnêye, yê bêhin û tam xweşe.

**کەرقەبیانێ**: یارییەکە ئێک دێ خوە کو د کەت یێ دی دێ خوە دسەر پشتێ راهاڤێت
(لعبه رياضيه)
**Kerqebyanê**: Yarîyeke êk dê xwe kod ket yê dî dê xwe diser piştêrra havêt.

**کەرکوخک**: تەخلیتەکێ گییایێ دێمە
(نبات عشبی)
**Kerkuxk**: Texlîtekê gîyayê dême.

**کەرکول**: توخمەکێ گییایێ مشتێ یە
(نبات عشبی للعلف)
**Kerkol**: Tuxmekê gîyayê miştêye.

**کەرکەروک**: کەلکەلانکێ پاش ملی، هەستییێ پشتا ملی
(لوح الکتف، عظم المنکب)
**Kerkerok**: Kelkelankê paş milî, hestîyê pişta milî.

**کەرکەرە**: کەرچوڤە، کەتوەر
(الاهوج، الاحمق، الفظ، الصمکوک)
**Kerkere**: Kerçûve, ketwer.

**کەرکێ کەراجو**: شینشینک، تەخلیتەکێ تەیرایە رەنگێ وی یێ شین وقوهوەیی یە
(الاخیل، الخضیری، طائر)
**Kerrkêkerraco**: Şînşînk, texlîteke teyraye, rengê wî yê şîn û qehweyê ye.

**کەرک**: کەرێ فێقییێ وەک کویزایە، کویزیێ فێقییێ هشک
(الاثمار الفجه)
**Kerrik**: Kerê fêqîyê wek kwîzaye, kwîzîyê fêqîyê hişk.

**کەرک**: گورێ مەرزێ راژێرکا یە، وەک لێڤا حێسیلێ
(حافه الحصیر المنسوج)
**Kerrik**: Gorê merzê rrajêrkaye, wek lêva hêsîlê.

**کەرک**: کویزیێ فێقییێ هشک، کەرێ گویزێ
(شطر الجوز)
**Kerrik**: Kwîzîyê fêqîyê hişk, kerê gwîzê.

**کەرموز**: توخمەکێ مێشایە، لدەوارا کوم دبیت ئو خوینا وان دمێژیت، تەخلیتەکێ مێشە رەشکێت مەزنە
(النبره، ج، انبار، القمعه، الرازه)
**Kermoz**: Tuxmekê mêşaye, li dewara kom dibît û xwîna wan dimêjît, texlîtekê mêşe reşkêt mezine.

**کەرمەلێس**: توخمەکێ میریشکایە، میریشکێت بشاخ
(صنف من الدجاج)
**Kermelês**: Tuxmekê mîrîşkaye, mirîşkêt bi şax.

**کەرهەژە**: مروڤێ شە پەشور، کەسێ سست وپست وژبەرک چوی، راهوولە، هەلمشە
(الخامل، المترهل، المتهرئ)
**Kerheje**: Mirovê şepeşorr, kesê sist û pist û ji berikçûy rrahole, helmişe.

**کەرهەژیی**: شەپەشوری، کەسێ سست وپست وژبەرک چویی، راهوولەیی، هەلمشەیی
(الخمول، الترهل، الرخوه للانسان)
**Kerhejeyî**: Şepeşorrî, kesê sist û pist û ji berik çûyî, raholeyî, helmişeyî.

**کەرهە**: گییایەکێ بەلگ پەحن، رەنگ خوەلیکی یە رهێت وی بەنیشتەکێ پێڤە، دەرمانێ ئێشا پشتێ یە
(العکوب، نبات عشبی یداوی بلبانه)
**Kerhe**: Gîyayekê belg pehin reng xwelîkîye rihêt wî benîştekê pêve, dermanê êşa piştêye.

**کەرەو**: مروڤێ کارەکی دکەت، کریارکەر، شول کەر
(الفاعل، الصانع)
**Kerew**: Mirovê karekî diket, kiryarker, şolker.

**کەرەتوین**: دوی دانا ساخلەمی وپاقژکرنا ژمیکروبا
(المحجر الصحی، الغمام)
**Kerretwîn**: Dwî dana saxlemî û paqijkirina ji mîkroba.

**کەروڤە**: غولپەلێل، مژوموران، باگەر، باهوز، باروڤە
(العاصفه، الزوبعه، الغمام، الضباب)
**Kerrove**: Xulpelêl, mijû moran, bager, bahoz, barrove.

**کەروفەر**: ئارێش وڤارێش، کرین وفروتن، بازرگانی
(البیع والشراء، التجاره)
**Kerrûferr**: Arêş û varrêş, kirrîn û firotin, bazirganî.

**کەروەستای**: نەشیای، بێچارە، لێواز، قر، گوروج، دەست ئێش
(العاجز، الفاشل، الضعیف)
**Kerwestay**: Neşyay, bêçare, lêwaz, qirr, guroc, destêş.

**کەر**: گوهـ گران
(الاطرش)
**Kerr**: Guhgiran.

**کەری، کەریاتی**: کوھ گرانی، گولێ نەبونی

(الطرش، الصمم، الصلح)

**Kerrî= Kerrîyatî**: Guhgiranî, gulê nebûn.

**کەرێ جوهییا**: توخمەکێ کولیایێ مەزنە

(صنف من اکبر الجراد)

**Kerê cuhîya**: Tuxmekê kulyaye yê mezine.

**کەزان**: توخمەکێ فێقیێ هشکە دکەلوژن کاکلاوی دخون

(حب الخضراء، البطم)

**Kezan**: Tuxmekê fêqîyê hişke di kelojin kakila wî dixon.

**کەزان کەلوژک**: توخمەکێ چویچکایە

(صنف من العصافیر)

**Kezankelojk**: Tuxmekê çwîçkaye.

**کەزاخە**: کوروپەکرنا داروباری، تابڕین، تایێت کرن وکورت کرن

(التقلیم، الشذب، القضب)

**Kezaxe**: Koroperkirina dar û barî, ta birrîn, tayêt kirin û kurtkirin.

**کەزاختن**: برینا تایێت دار وباری

(التقلیم، التشذیب، التقضیب)

**Kezaxtin**: Birrîna tayêt dar û barî.

**کەزاختی**: داروبارێ تاقەفاندی

(المقلم، المشذب، المقضب)

**Kezaxtî**: Dar û barê taqefandî.

**کەز**: کەڤز، رویز

(الطحلب، العذبه)

**Kez**: Keviz, rwîz.

**کەزاشین**: کەڤزا کەسک وەکی ریس وهریێ

(الکتان)

**Kezaşîn**: Kevza kesk wekî rîs û hiryê.

**کەزی**: پرچێ شورێ ڤەهاندی، ماتا پرچێ ڤەهاندی

(الضفیره، الجدیله، الغدیره)

**Kezî**: Pirçê şorrê vehandî, mata pirça pirçê vehandî.

**کەزی ستویرک**: رها سپی، رهێت خوینا پاقژ، رها دلی یا خوینا پاقژ بەلاف دکەت

(الاورطه، الشریان، الابهر)

**Kezîstwîrk**: Riha spî, rihêt xwîna paqij, rihê dilî ya xwîna paqij belav diket.

**کەزی**: داڤێت تەڤنی، ریشکێت جلکا، بژیک

(النیر، کالهدب للثوب صفاقته ولحمته)

**Kezî**: Davêt tevnî, rîşkêt cilka, bijîk.

**کەزی گە**: جووا ئاشی ژ سکری هەتا کوتەلێ، جووا ئاشی

(قناه ماء الرحی، ساقیه الطاحون)

**Kezîgih**: Cowa aşî ji sikrî heta kotelê, cowa aşî.

**کەزەب**: مێلاک، جەگەر

(الکبد، الوجدان، الضمیر)

**Kezeb**: Mêlak, ceger.

**کەزەب**: زکا، ئاهێ ساخی وژییارێ

(الغذاء، المغذی، الحیوی، الماده الغذائیه، القیمه الغذائیه)

**Kezeb**: Zika, ahê saxî û jîyarê.

**کەزانی**: رەنگێ کەسک

(اللون الفستقی، الاخضر الفاتح)

**Kezanî**: Rengê kesk.

**کەژ**: سپی، سپیێ برقوک، مروڤێ سپی وموی زەر

(الیلق، الیقق، الامره، الامهق، المرهاء للانسان)

**Kej**: Spî, spîyê berqok, mirovê spî û mwî zer.

**کەژ**: حێوانێ سیس

(اللهاق، اللهق، الملهق للحیوان)

**Kej**: Hêwanê sîs.

**کەژی، کەژاتی**: سپییاتی، سور و سپییاتیا موی زەر

(المرهه، المهقه، اللهقه، اللهاق)

**Kejî = Kejatî**: Spîyatî, sor û spîyatîya mwî zer.

**کەسپک**: توخمەکێ قویچکایە بخوە ڤەدهەلاویسن ژ چاڤ لێدانێ، توخمەکێ موهرکێت پارازتنا ژ چاڤ لێدانێ

(الحوط، خرزیشد، للوقایه من العین)

**Kespik**: Tuxmekê qwîçkaye bixwe ve dihela wîsin ji çav lêdanê, tuxmekê muhirkêt paraztina ji cav lêdanê.

**کەسپک**: قویچک، بەندوشک، بشکوژ

(الزر، الزره)

**Kespik**: Qwîçik, bendoşk, bişkoj.

**کەسپکا چاڤی**: رەشکا چاڤی

(حدق العین)

**Kespka çavî**: Reşka çavî.

**کەسک**: ڕەنگێ کەسک، سەبز
(الاخضر)

**Kesk**: Rengê kesk: Sebiz.

**کەسک بون**: سەبز بون
(التخضر، الاخضرار)

**Keskbûn**: Sebizbûn.

**کەسک بوی**: سەبز بوی
(المخضر)

**Keskbûy**: Sebizbûu.

**کەسک تر**: سەبز تر
(الاکثر خضره)

**Kesktir**: Sebiztir.

**کەسک کرن**: سەبز کرن
(التخضیر، الاخضار)

**Keskkirin**: Sebizkirin.

**کەسک کری**: سەبز کری
(المخضر)

**Keskkir**: Sebizkirî.

**کەسکی، کەسکاتی**: سەبزی، سەبزییاتی
(الخضره)

**Keskî = Keskîyatî**: Sebizî, sebizîyatî.

**کەسیرە**: وەستای، تەوخی، کەرخی، کوسک
(اللاغب، النافه، النفیه، المنهک، التعبان، المهوک)

**Kesîre**: Westay, tewixî, kerixî, kusk.

**کەسیرەبون**: وەستان، تەوخین، کەرخین، کوسک بون
(التنهک، اللغب)

**Kesîrebûn**: Westan, tewixîn, kerixîn, kuskbûn.

**کەسیرە بوی**: وەستای، کەرخی، کوسک بوی، تەوخی
(المتعب، المغلوب، المنهک)

**Kesîrebûy**: Westay, kerixî, kuskbûy, tewixî.

**کەسیرەتر**: وەستای تر: کەرخی تر، کوسک تر، تەوخی تر
(الاتعب، الالغب، الانهک، الاعیی، الانفه)

**Kesîretir**: Westaytir, kerixîtir, kusktir, tewixîtir.

**کەسیرەکرن**: وەستاندن، کەرخاندن، کوسک کرن، تەوخاندن
(الاتعاب، الالغاب التنفیه، الانهاک)

**Kesîrekirin**: Westandin, kerixandin, kuskkirin, tewixandin.



**کەسیرەکری**: وەستاندی، کەرخاندی، کوسک کری، تەوخاندی
(المنهک، المغلب، المنفه، المتعب)

**Kesîrekirî**: Westandî, kerixandî, kuskkirî, tewixandî.

**کەسم، کەسمە**: چەکوچ، قودیم، قەرەم، لەش، کەلەخ، بەژن وبالا، قەلافەت
(الهیئه، الهیکل، الجرم، الحجم، الصوره، القیافه، الشکل)

**Kesm = Kesme**: Çekûç, qodîm, qerrem, leş, kelex, bejin û bala, qelafet.

**کەسمەدار**: کەلەخدار، قودیم دار، لەشین
(المجسم)

**Kesmedar**: Kelexdar, qodîmdar, leşîn.

**کەس**: خوە، مروڤ
(الشخص، الذات، المرء، الاهل)

**Kes**: Xwe, mirov.

**کەسینی، کەساتی**: خوەیاتی، خوەینی، مروڤیاتی، مروڤاتی، مروڤینی
(الشخصیه، الذاتیه)

**Kesînî = Kesatî**: Xweyatî, xweyînî, mirovîyatî, mirovatî, mirovînî.

**کەسرەوان**: توخمەکێ دەرسوکێت سەرێ ژنکانە، پوشییا ژنا
(غطاء الرأس للنساء)

**Kesrewan**: Tuxmekê dersokêt serê jinkane poşîya jina.

**کەسک وسور**: کڤانێ بارانا گەلەک ڕەنگ، کڤانێ ڤێک کەتنا باران وهەتاڤا
(قوس قزح)

**Keskûsor**: Kivanê barana gelek reng, kivanê vêkketina baran û hetava.

**کەسەر**: کوڤان، خەمباری، خەمگیری، خەمگین، داما ن
(الحسره، الاسی، الهم)

**Keser**: Kovan, xembarî, xemgîrî, xemgîn, daman.

**کەسەردار**: کوڤاندار، خەمبار، خەمگین، خەم گیر، دامای
(الحسیر، المتحسر، الآسی، المهموم)

**Keserdar**: Kovandar, xembar, xemgîn, xemgîr, damay.

**کەسەرداری**: کوڤانداری، خەمگینی، خەمگییر، دامانی
(التحسر، الاسیه)

**Keserdarî**: Kovandarî, xemgînî, xemgîrî, damanî.

**کەسەک**: مروڤەک، پییاوەک، جامێرەک
(امرء، شخص ما)
**Kesek**: Mirovek, pîyawek, camêrek.

**کەس ناس**: خوەیاتی زان، مروڤ نییاس
(عالم النفس، خبیر نفسانی)
**Kesnas**: Xweyatzan, mirov nîyas.

**کەس ناسی**: مروڤ ناسی، خوەیاتی ناسی
(علم النفس)
**Kesnasî**: Mirov nasî, xweyatî nasî.

**کەش**: کەچ، ڤڕ، خار، شەت، ڤارێ، بادای، چەپ دای
(الصرد، الطائش، المحرف، المنحرف)
**Keş**: Keç, virr, xar, şet, varrê, baday, çepday.

**کەش بون**: کەچ بون، شەت بون، خار بون، ڤارێ بون، بادان، چەپ دان، ڤڕبون
(التطیش، التصرد، التحرف)
**Keşbûn**: Keçbûn, şetbûn, xarbûn, varrêbûn, badan, çepdan, virrbûn.

**کەش بوی**: کەچ بوی، شەت بوی، خار بوی، ڤارێ بوی، بادای بوی، پەچ بوی، چەپ دای، ڤڕبوی
(المحرف، المصرد، المطیش)
**Keşbûy**: Keçbûy, şetbûy, xarbûy, varrêbûy, badaybûy, peçbûy, çepday, virrbûy.

**کەش تر**: کەچ تر، شەت تر، خارتر، ڤارێ تر، بادای تر، چەپدای تر ڤڕتر
(الاحرف، الاصرد، الاطیش)
**Keştir**: Keçtir, şettir, xartir, varrêtir, badaytir, çepdaytir, virrtir.

**کەش کرن**: کەچ کرن، شەت کرن، خارکرن، ڤارێ کرن، بادان کرن، چەپدان ، ڤڕکرن
(التحریف الاحراف، التطیش، الاصراد، التصرید، الاطاشه)
**Keşkirin**: Keçkirin, şetkirin, xarkirin, varrêkirin, badankirin, çepdan, virrkirin.

**کەش کری**: کەچ کری، شەت کری، خارکری، ڤارێ کری، ڤڕکری، بادای کری، چەپدای
(المطیش، المصرد، المحرف)
**Keşkirî**: Keçkirî, şetkirî, xarkirî, varrêkirî, virrkirî, badaykirî, çepday.

**کەشی، کەشاتی**: کەچی کەچیاتی، شەتی، شەتیاتی، ڤارێیاتی، بادانی، چەپینی، ڤڕاتی، خاریاتی
(الطیش، الانحراف، الصرد، الزحروف، الحرف)
**Keşî = Keşîyatî**: Keçî, keçîyatî, şetî, şetîyatî, varrêyatî, badanî, çepînî, virratî, xarîyatî.

**کەش بڕ**: کەچ بر، شەت بر، خوەهر بڕ، بروار بڕ
(المنحرف، شبه منحرف)
**Keşbirr**: Keçbir, şetbir, xwehirbir, birwarbir.

**کەشک**: سەرکێت شیرڕێژا هشک کری
(الاقط، الکریص، الکریز)
**Keşk**: Serkêt şîrrêja hişkkirî.

**کەشک بشێڤ**: شکەڤا بشافتنا کەشکی
(المحصنه، مذوبه الاقط، قصعه من خزف)
**Keşkbişêv**: Şkeva bişaftina keşkî.

**کەشکەلکێ ئاخێ**: تەقالکێ ئاخا هشک
(الصلصال)
**Keşkelkê axê**: .Teqalka axa hişk.

**کەشکول**: کودێ خازوکێ، تویرێ خازتنێ
(المدعه، وعاء المتسول)
**Keşkol**: Kodê xazokê, twîrê xaztinê.

**کەشکول**: قەلپێ کولندی یێ پرت، کولندێ پەلخاندی
(الدباء، المکسور)
**Keşkol**: Qelpê kulindî yê pir,t kulindê pelixandî.

**کەشکەلانک**: توخمەکێ زیوانێ یە، گلێشی ناڤ دخل ودانی
(المریرا، نوع من الزوان)
**Keşkelank**: Tuxmekê zîwanêye, gilêşê nav dexl û danî.

**کەشخە**: پەرلاق، ترتوز، تڤتڤاندی
(المتبختر، المزهو، المختال الانیق)
**Keşxe**: Perlaq, tirtoz, tivtivandî.

**کەشخەبون**: پەرلاق بون، ترتوز بون، تڤتڤاندن بون
(التبختر، التأنق)
**Keşxebûn**: Perlaqbûn, tirtozbûn, tivtivandinbûn.

**کەشخە بوی**: پەرلاق بوی، ترتوز بوی، تڤتڤاندی بوی
(المتبختر، المتزهی، المختال، المؤنق)
**Keşxebûy**: Perlaqbûy, tirtozbûy, tivtivandîbûy.

**کەشخەتر**: پەرلاق تر، ترتوز تر، تڤتڤاندی تر
(الاکثر تبخترا، واختیالا، الانیق)
**Keşxetir**: Perlaqtir, tirtoztir, tivtivandîtir.

**کەشخە کرن**: پەڕلاق کرن، ترتوزکرن، تفتڤاندن
(الازدهاء، التأنيق)

**Keşxekirin**: Perlaqkirin, tirtozkirin, tivtivandin.

**کەشخە کری**: پەڕلاق کری، ترتوز کری، تفتڤاندی
(المبختر، المزهی، المؤنق)

**Keşxekirî**: Perlaqkirî, tirtozkirî, tivtivandî.

**کەشخەیی، کەشخاتی، کەشخەیاتی**: پەڕلاقی، ترتوزی، تفتڤاندنی، کەشخەیاتی
(الزهو، الخیلاء، التبختر، الاناقه)

**Keşxeyî = Keşxeyatî = Keşxatî**: Perlaqî, tirtozî, tivtivandînî, keşxeyatî.

**کەشخەچی**: پەڕلاق، ترتوز، تفتڤین، تفتڤاندی
(المتأنق، المزهی، المبختر)

**Keşxeçî**: Perlaq, tirtoz, tivtivîn, tivtivandî.

**کەشکە**: دانە لوق، دان قوتا روهن
(الهریسه)

**Keşke**: Daneloq, danquta rohin.

**کەشکین**: دانەلوقا دەوی
(هریسه الاقط)

**Keşkîn**: Daneloqa dewî.

**کەشیش**: قەشە، مەلایێ فەلا
(القسیس، القس، رتبه نصرانیه)

**Keşîş**: Qeşe, melayê Fela.

**کەشەفرێت**: باقوڕە، تشابەت، ڕەپەچول
(الفاحش، الجلف، العملاق)

**Keşefirêt**: Baqorre, tişabet, repeçol.

**کەشەفرێتی**: باقوڕەیی، ڕەپەچولی
(الفحش، الجلافه، العملقه، ضخامه الجثه)

**Keşefirêtî**: Baqorreyî, repeçolî.

**کەف**: تویکێ تشتێ روهن
(الرغو، الزبد)

**Kef**: Twîkê tiştê rohin.

**کەف**: درێژیا ناڤبەرا تبلابەرانا وشکەڤ ئالیسکێ
(الالب، الفتر، بین السبابه و الابهام)

**Kef**: Dirêjiya navbera tibla berana û şkev alîskê.

**کەفا گییای**: قەفتا گییای، سڤالا گییای
(الثمه، الاباله، الحزمه)

**Kefa gîyay**: Qefa gîyay, sivala gîyay.

**کەفا گولا**: قەفتا گولا، دەستکێ گولا
(الباقه، الاکلیل)

**Kefa gula**: Qefta gula, destkê gula.

**کەفچک**: ئامویرێ گرار خارنێ
(الملعقه)

**Kefçik**: Amwîrê girar xarnê.

**کەفچ**: ناف کور، بەلەڤاژی، قەوری
(المقعر)

**Kefç**: Navkur, belevajî, qewirî.

**کەفچ بون**: ناف کور بون، بەلەڤاژی بون، قەورین
(التعقر)

**Kefçbûn**: Navkurbûn, belevajîbûn, qewirîn.

**کەفچ بوی**: ناف کور بوی، بەلەڤاژی بوی، قەوری
(المعقر)

**Kefçbûy**: Navkurbûy, belavajîbûy, qewirî.

**کەفچ تر**: ناف کورتر، بەلەڤاژی تر، قەوری تر
(الاعقر)

**Kefçtir**: Navkurtir, belevajîtir, qewirîtir.

**کەفچ کرن**: ناف کورکرن، بەلەڤاژی کرن، قەوراندن
(التعقیر، الاعقار)

**Kefçkirin**: Navkurkirin, belevajîkirin, qewirandin.

**کەفچ کری**: ناف کورکری، بەلەڤاژی کری، قەوراندی
(المعقر)

**Kefçkirî**: Navkurkirî, belevajîkirî, qewirandî.

**کەفچی، کەفچییاتی**: ناف کوری، بەلەڤاژیاتی، قەورینی، قەورینیاتی
(العقر)

**Kefçî = Kefçîyatî**: Navkurî, belevaîjyatî, qewirînî, qewirînyatî.

**کەفخوێ**: سەروکێ گوندی، رە سپیێ گوندی، سەرگێڕێ گوندی، بەرپرسێ گوندی، مال خوێ گوندی
(المختار، العمده، وجیه القریه)

**Kevxwê**: Serokê gundî, rihspîyê gundî, şergêrrê gundî, berpirsê gundî, malxwê gundî.

**کەفیک**: دەسمالک، دەست مال
(المندیل)

**Kefîk**: Desmalk, destmal.

**کەف کویر**: هوسکویک، کەفچکێ تێکفەدانێ
(المغرفه)

**Kefkwîr**: Huskwîk, kevçkê têkvedanê.

**کەفەل:** ناڤ تەنگ، جهێ شویتکێ، زراڤیا ناڤ تەنگێ، ناڤبەرا سێڤ سێڤکا ڕانی وپراسیا، خالی گەه
(الردف، الخاصره)
**Kefel**: Navteng, cihê şwîtkê, ziravîya navtengê, navbera sêvsêvka ranî û pirasîya, xalîgih.

**کەڤیچ:** توخمەکێ بزنایە، تەخلیتەکێ پەزێ ڕەشە
(صنف من العنز)
**Kevîç**: Tuxmekê biznaye, texlîtekê pezê reşe.

**کەفک:** تویک، سەرتویک، تیڤلێ لسەر تشتێ روهن و مەیی
(الدوايه، الزبد)
**Kefik**: Twîk, sertwîk, tîvlê li ser tiştê rohin û meyî.

**کەفاشیری:** پەقویژکێت سەر شیرێ دوتی
(الجفاله للحليب)
**Kefa şîrî**: Peqwîjkêt ser şîrê dotî.

**کەفا شیری:** دەستکێ شیری، قەفتا شیری
(مقبض السيف)
**Kefa şîrî**: Destkê şîrî, qefta şîrî.

**کەفا بزوتی:** ئاڤا دداری سووتی داد دێرهیت، ئاڤا دبزووتێ سووتی دادهێت
(النسيس يكون فی رأس العود عند الحرق)
**Kefa bizotî**: Ava didarê sotîda didêrhêt, ava dibizotê sotî da dihêt.

**کەفا خەنجەرێ:** قەفتا خەنجەرێ، دەستکێ خەنجەرێ
(مقبض الخنجر)
**Kefa xencerê**: Qefta xencerê, destkê xencerê.

**کەفسە:** هەفسرین، فیش چون، زک چون، ریخ کرن، پیق هاڤێتن
(الزحار، الدوسنطاريا)
**Kefse**: Hefsirûn, fîşçîn, rîxkirin, pîqhavêtin.

**کەفا کوپالی:** کڤانکێ گوپالی، بازنکێ گوپالی
(القعف، العذب، المحجن، القنح)
**Kefa gopalî**: Kivankê gopalî, bazinkê gopalî.

**کەف زک:** وەستان، کوسک بون، کەرخین، تەوخین، حلک حلک، ئەزمان ددڤیدا هاتن
(البهر، اللهث، النهج، اللهاث، شده الاعياء)
**Kefzik**: Westan, kuskbûn, kerixîn, tewixîn, hilk-hilk, ezman di devî da hatin.

**کەف زکی:** کەرخین، وەستانی، کوسکی، تەوخینی
(البهره، اللهث)
**Kefzikî**: Kerixîn, westanî, kuskî, tewixînî.

**کەف دان:** تویک دان، پەقویژک دان، پەقویژک هەلاڤێتن
(الكثأ، الجفأ للقدر)
**Kefdan**: Twîkdan, peqwîjkdan, peqwîjkhela vêtin.

**کەفتن:**
(الوقوع، السقوط، الرسوب)
**Keftin.**

**کەفتی:**
(الواقع، الساقط، الراسب)
**Keftî.**

**کەفتە:**
(الموقع)
**Kefte.**

**کەفش:**
(الابط، الكتف)
**Kefş.**

**کەفەلا دەستی**
(القتر، الالب بين السبابه والابهام من الكف)
**Kefela destî.**

**کەفا شیفکا**
(البورق، ملح التراب، زبد الماء، المالح)
**Kefa şîfka.**

**کەڤ**
(المحيط)
**Kev.**

**کەڤی:**
(الاطار)
**Kevî.**

کەڤیا بێژنگێ
(الحتال للغربال)
**Kevya bêjingê.**

**کەڤیا بەفرێ:**
(النقاء، المحدودب من قطع الثلج، الحقف)
**Kevîya befrê.**

**کەڤژک:** گەرکا پویرتی، کەڤلکی پرچێ
(الابريه، الهبريه، الخزازه، السبكه)
**Kevjik**: Gerka pwîrtî, kevilkê pirçê.

**کەڤن**: مێژ، کەڤنار، پێشین، برێ دا
(العتيق، التقديم)

**Kevin**: Mêj, kevnar, pêşîn, berêda.

**کەڤن بون**: مێژبون، پێش بون، کەڤنار بون، بەرێدا بون
(التعتق، التقادم)

**Kevinbûn**: Mêjbûn, pêşbûn, kevnarbûn, berêdabûn.

**کەڤن بوی**: کەڤناربوی، مێژبوی، پێشین بوی، بەرێدابوی
(المعتق، المتقادم)

**Kevinbûy**: Kevnarbûy, mêjbûy, pêşînbûy, berêdabûy.

**کەڤن تر**: کەڤنارتر، مێژتر، پێشین تر، بەرێدا تر
(الاعتق، الاقدام)

**Kevintir**: Kevnartir, mêjtir, pêşîntir, berêdatir.

**کەڤن کرن**: کەڤنار کرن، مێژکرن، پێشین کرن
(التعتيق، الاعتاق، التقديم)

**Kevinkirin**: Kevnarkirin, mêjkirin, pêşînkirin.

**کەڤن کری**: کەڤنار کری، مێژ کری، پێشین کری
(المعتق، المقدم)

**Kevinkirî**: Kevnarkirî, mêjkirî, pêşînkirî.

**کەڤنی، کەڤناتی**: کەڤناری، کەڤناریاتی، پێشینی، بەێیاتی، مێژی، مێژییاتی
(العتق، القدم، الاثرى)

**Kevnî = Kevnîyatî**: Kevnarî, kevnarîyatî, pêşînî, berêyatî, mêjî, mêjîyatî.

**کەڤنار**: کەڤن، مێژ، پێشین، بەرێ، سەرڤەچوی، بوری
(العتيق، القديم، الاثرى)

**Kevnar**: Kevin, mêj, pêşîn, berê, serveçûy, borî.

**کەڤناری**: کەڤناتی، کەڤنی، مێژی، مێژیاتی، پێشیاتی، بەرێ، بەرێاتی سەرڤەچونی
(القدم، العتق)

**Kevnarî**: Kevnatî, kevnî, mêjî, mêjîyatî, pêşîyatî, berê, berêyatî, serveçûnî.

**کەڤنەشوین**: شوین ونیشانێت کەڤن وبەرێ
(الآثار القديمه)

**Kevne şwîn**: Şwîn û nîşanêt kevin û berê.

**کەڤنە شوین زان**: زانایێ شوینێت بەرێ
(عالم الآثار)

**Kevne şwînzan**: Zanayê şwînêt berê.

**کەڤیژو**: کەسێ گلیزا توفێ بدەڤیدا دهێت خارێ، مروڤی کلمیشوک
(المرول)

**Kevîjo**: Kesê gilîza tofê bi devîda dihêt xarê, mirovê kilmîşok.

**کەڤیژە**: کەفا بدڤیدا دهێت، گلیزا دەڤی
(الروال)

**Kevîje**: Kefa bi devîda dihêt, gilîza devî.

**کەڤیژەیی**: کلمیشوک، دەڤ گلیزەیی، کلمیشوکی
(الرول)

**Kevîjeyî**: Kilmîşok, devgilîzeyî, kilmîşokî.

**کەڤوت**: دارەکە لچیا چێدبیت، دارێ وی کەفچک و ئامانکێت داری ژێ چێدکەن، شڤێت وی دکەن باسکێ جگارا
(الرثم، البقس، القطف، شجر جبلي متين الخشب وصلب)

**Kevot**: Dareke li çîya çê dibît, darê wî kefçik û amankêt darî jê çê diken, şivêt wî diken baskê cigara.

**کەڤلوژان**: قەلپویچک: کاڤلوژانک
(القنبع، الكمامه، للزهر والورد)

**Kevlojan**: Qelpwîçk, kevlojank.

**کەڤلوژانکێ کەلیکێ**: هنبانکا کەلیکێ، تویرکێ کەلیکا
(السنف، السناف، خريطه النبات فيها حب، كالفاصوليا)

**Kevlojankê** kelîkê: Hinbanka kelîkê, twîrkê kelîka.

**کەڤر**: کاشەبەر، بەرێ مەزن
(الصخر)

**Kevir**: Keşeber, berê mezin.

**کەڤز**:کەز، رویز، دەزیلوکێ ئاڤێ یێ کەسک، گیایەکی وەکی هریێ دئاڤا راوەستای دا چێدبیت
(الطحلب، العذبه)

**Kevz**: Kez, rwîz, dezîlokê avê yê kesk, gîyayekê wekî hiryê di ava rawestay da çêdibît.

**کەڤزا کەسک**: رویزێ ئاڤێ یێ رەنگ کەسک
(الكتان)

**Kevza kesk**: Rwîzê avê yê reng kesk.

**کەڤن ونوی**: تشتێ دەست ڤەدای، تشتێ خەسپالە، تشتێ شۆل پێ گرتی
(المستعمل)

**Kevin û nwî**: Tiştê dest veday, tiştê xespale, tiştê şol pê girtî.

**کەڤنە شوین زانین**: زانینا شوینێت پێشین
(علم الآثار)
**Kevin şwînzanîn**: Zanîna şwînêt pêşîn.

**کەڤنک**: دەرسوکا سەری، جەمەدانی، پوشی
(المجمدانی، غطاء الرأس)
**Kevink**: Dersoka serî, cemedanî, poşî.

**کەڤنە ریش**: ئێشاکەڤن، برینا کەڤن و نەساخ بوی
(المرض المزمن، الجرح المزمن، الداء المزمن، المزمن العامه)
**Kevne rîş**: Êşa kevin, birîna kevin û nesaxbûy.

**کەڤنە برین**: برینا هەودای ڤە
(القرحه المزمنه)
**Kevne birîn**: Birîna hewday ve.

**کەڤل هوسین**: پیست حولی کرن، چەرم تیل کرن
(المأس، المحس، العرک)
**Kevilhusîn**: Pîst hulîkirin, çerimtîlkirin.

**کەڤ، کەڤو**: سەیێ ناڤ بەرا خمخمکێت وی پنیەکا رەش لێ
(الهرثم، الهرثمه، سواد بین منخری الکلب)
**Kev** : Kevo: Seyê nav bera ximximkêt wî pinîyeka reş lê.

**کەڤرین**: کەسێ هی ب هەلباسک بونا کەڤرا، شارەزایێ لکەڤرا سەرکەتنێ
(الصخری، الخبیر فی تسلق الصخور، هوایه تسلق الصخور)
**Kevrîn**: Kesê hî bi helbask bûna kevra, şarezayê li kevra serketinê.

**کەڤلوژانک**: کاڤلان، قەلپویچک، کابلوخک
(الغمد، الغلاف)
**Kevlojank**: Kavlan, qelpwîçk, kabloxk.

**کەڤل**: پیست، چەرم، تیڤل، قەلپ
(الجلد، القشره، القشر)
**Kevil**: Pîst, çerim, tîvil, qelp.

**کەڤلین**: تشتێ ژکەڤلی هاتی چێکرن
(الجلدی)
**Kevlîn**: Tiştê jikevlî hatî çêkirin.

**کەڤلێ خاڤ**: چەرمێ نەگەمار کری
(الاهاب)
**Kevlêxav**: Çermê negemarkirî.

**کەڤلێ گەنی**: پیستێ رزی، چەرمێ حەفنی
(العطن)
**Kevlêgenî**: Pîstê rizî, çermê hefinî.

**کەڤەر**: توخمەکێ پەزێ شیشە
(الواخط من الغنم)
**Kever**: Tuxmekê pezê şîşe.

**کەڤەری**: شیشی
(الوخط)
**Keverî**: Şîşî.

**کەڤلی گەمارکری**: کەڤلێ هاتی گەمار کرن وهوسین
(الادیم)
**Kevlê gemarkirî**: Kevlê hatî gemarkirin û husîn.

**کەڤلە پیر**: توخمەکێ گیبایێ بەلگ پانە، بەلگێت وی دکەن ئیپراخ، نێرکا وی خاف دخون
(نبات عشبی یؤکل طریا و مطبوخا)
**Kevlepîr**: Tuxmekê gîyayê beligpane, belgêt wî diken îprax, nêrka wî xav dixon.

**کەڤێ**: توخمەکێ گیبایێ ئالف ومشتێ یە
(نبات عشبی للعلف)
**Kevê**: Tuxmekê gîyayê alif û miştêye.

**کەڤلێ بهری**: چەرمێ نەهوسی، پیستی بموی ونەڤەرەنی
(المصحب)
**Kevlê bihirî**: Çermê nehusî, pîstê bi mwî û neverenî.

**کەڤلی بپویرت**: کورک
(الفرو، الفراء، الفروه)
**Kevlê bi pwîrrt**: Kurk.

**کەڤان**: کڤان، تشتێ چەماندی، ڤەچەماندیێ خڕ
(القوس، الزنبرک)
**Kevan**: Kivan, tiştê çemandî, veçemandî yê xir.

**کەڤان ژەن**: کویرنج، هری ژەن
(الحلاج، النداف)
**Kevanjen**: Kwîrinc, hirîjen.

**کەڤنە ژن**: بی ژن، ژنامێر مری، پیرەژن، سەرەژن
(الارمله، العجوز)
**Kevnejin**: Bîjin, jina mêr mirî, pîrejin, serjin.

**کەڤوک**: کوتر
(الحمام)
**Kevok**: Kotir.

**کەڤلوز**: ددان کەتی، کارومە
کەڤلوزی: ددان کەتینی، کارومەیی
(الافرم، الالدرسه)

**Kevloz= Kevlozî**: Didanketî, karrome, didan ketînî, karromeyî.

**کەک**: برا
(الاخ)

**Kek**: Bira.

**کەکاتی کەکینی**: براینی، بەرایەتی
(الأخاء، الاخوه)

**Kekatî = Kekînî**: Biraynî, berayetî.

**کەک بون**: برا بون، براینی بون، برایەتی بون
(التآخی)

**Kekbûn**: Birabûn, biraynîbûn, birayetîbûn.

**کەک بوی**: برابوی، براینی بوی، برایەتی بوی
(المتآخی)

**Kekbûy**: Birabûy, birayînîbûy, birayetî bûy.

**کەک تر**: برا تر، براینی تر، برایەتی تر
(الاکثر آخا)

**Kektir**: Biratir, birayînîtir, birayetîtir.

**کەک کرن**: براکرن، براینی کرن، برایەتی کرن
(الاخاء)

**Kekkirin**: Birakirin, birayînîkirin, birayetîkirin.

**کەک کری**: برا کری، براینی کری، برایەتی کری
(المؤاخی)

**Kekkirî**: Birakirî, birayînîkirî, birayetîkirî.

**کەکێ، کەکو**: برا، یانی یا برا، برایێ من
(یا اخ، ایها الاخ، اخی بصیغه النداء)

**Kekê = Keko**: Bira, yanî ya bira, birayê min.

**کەل**: کەلین، برچک هەلاڤێتن، سەر وبن بونا ئاڤا گەرم
(الغلی، الفور)

**Kel**: Kelîn, birçik helavêtin, ser û binbûna ava gerim.

**کەل**: گەرم، شارهان، شارهای، تێهن
(الحار، الساخن)

**Kel**: Gerim, şarhan, şarhay, têhin.

**کەل**: ڤێک کەتنا تشتێ دوتا، جهێ ڤێک کەتنا تشتی، جهێ ژێک ڤەدەر بونا تشتی ودوتابونێ
(الشعبه، ملتقی الشیء ومفترقه)

**Kel**: Vêkketina tiştê du ta, cihê vêkketina tiştî, cihê jêk vederbûna tiştî û du ta bûnê.

**کەل**: قەلات، چەپەر، دیرگە
(القلعه)

**Kel**: Qelat, çeper, dîrgih.

**کەل**: گوهنێلا حێوانێ رەش، گوهنێلا گارەشی
(الفحل للحیوان، النزوه للابقار)

**Kel**: Guhnêla hêwanê reş, guhnêla ga reş.

**کەل**: نێرییێ کویڤی
(التیس الجبلی، الوعل)

**Kel**: Nêrîyê kwîvî.

**کەل**: شەرگەه، ڤێک کەتنا هەردو رانا، ناڤ ران
(ملتقی الفخذین للمرء)

**Kel**: Şergeh, vêkketina her du rana, navran.

**کەلین**: سەر وبن بونا ئاڤا شارهای وگەرم کری
(الغلیان، الفوران)

**Kelîn**: Ser û bin bûna ava şarhay û gerimkirî.

**کەلاندن**: شاراندن، گەرم کرن
(الاغلاء، التفویر)

**Kelandin**: Şarandin, gerimkirin.

**کەلاندی**: تشتێ شاراندی، تشتێ گەرم کری
(المغلی، المفور)

**Kelandî**: Tiştê şarandî, tiştê gerimkirî.

**کەلی**: تشتێ هاتی کەلاندن، تشتێ کەل بوی، تشتێ شارهای
(المغلی، الفائر)

**Kelî**: Tiştê hatî kelandin, tiştê kelbûy, tiştê şarhay.

**کەلابە**: کڤانوکێ ستویێ گاجوتی، ئامویرەکێ هەڤجاری یە، چەنگال
(السمیق، خشبه النیر تحیط بعنق الثور)

**Kelabe**: Kivanokê stûyê ga cotî, amwîrekê hevcarîye, çengal.

**کەل بون**: گەرم بون، شارهان
(التسخین)

**Kelbûn**: Gerimbûn, şarhan.

**کەل بوی**: گەرم بوی، شارهای بوی
(المسخن)

**Kelbûy**: Gerimbûy, şarhaybûy.

**کەل تر**: گەرم تر، شارهای تر
(الاسخن، الاحر)

**Keltir**: Gerimtir, şarhaytir.

کەل کرن: گەرم کرن، شاراندن
(التسخين، الاسخان)
**Kelkirin**: Gerimkirin, şarandin.

کەل کری: گەرم کری، شاراندی
(المسخن)
**Kelkirî**: Gerimkirî, şarandî.

کەلی، کەلاتی: گەرمی، گەرماتی، گەرمییاتی، شارهانی، شاریانی
(السخونه، الحراره)
**Kelî = Kelatî**: Germî, germatî, germîyatî, şarhanî, şaryanî.

کەل وپەل: تشت ومشت، خڕ و مڕ، پەرگار، وەج ومەج
(الاغراض، الادوات، الامتعه، البضاعه)
**Kelûpel**: Tişt û mişt, xirr û mirr, pergar, wec û mec.

کەلاپچە: بێنەک، بەستەک
(الغل، الکبل، القيد، الرسف)
**Kelapçe**: Bênek, bestek.

کەلاپچەبون: بێنان بون، بەستن بون، ئیشکدان بون، گرێدان
(التغلل، التقيد، التکبل، الترسف)
**Kelapçebûn**: Bênanbûn, bstinbûn,îşikdanbûn, girêdan.

کەلاپچەبوی: بێنای بوی، بەستی بوی، ئیشکدای بوی، گرێدای بوی
(المقيد، المغلول، المکبل، المرسف)
**Kelapçebûy**: Bênaybûy, bestîbûy,îşikdaybûy, girêdaybûy.

کەلاپچەتر: بێنای تر، بەستی تر، گرێدای تر
(الاغلل، الاقيد، الاکبل)
**Kelapçetir**: Bênaytir, bestîtir, girêdaytir.

کەلاپچەکرن: بێنان، ئیشکدان، بەستن، گرێدان
(الاغلال، التکبيل، التقييد)
**Kelapçekirin**: Bênan, îşikdan, bestin, girêdan.

کەلاپچەکری: گرێدای، ئیشکدای، بەستی، بێنای
(المقيد، المکبل، المغلل)
**Kelapçekirî**: Girêday, îşikday, bestî, bênay.

کەل پویچ، کەل پیچ: لبنێ ئاخا شاراندی، گومتلێ ئاخا قەلاندی
(الطوب، الآجره، اللبن، الطابوق الناری)
**Kelpwîç = Kelpîç**: Libinê axa şarandî, gumtilê axa qelandî.

کەلەپاچە: سەر وپێک، عویر ورویڤیک، کێپاری
(الکراع)
**Kelepaçe**: Serûpêk, 'wîr û rwîvîk, kêparî.

کەلەپویت: پویرە، دەست کەفت
(الغنيمه، النهبه، الفیٔ)
**Kelepwît**: Pwîre, destkeft.

کەل چون: خریڤێنک، ڤێ کەتن، گرینا تیژو ودژوار
(النشيج، النهيج، البکاء)
**Kelçûn**: Xirîqênk, vêketin, girîna tîj û dijwar.

کەلەخ: لەش، قودیم، چەکوچ، کەسمە، کەیس، قەرەم
(الشبح، الشخص، الهيکل، الهيئه، الحجم)
**Kelex**: Leş, qodîm, çekûç, kesme, keys, qerrem.

کەلەخ: جەندەک، لەش، قودیم
(الجسم، الجسد، الجرم، الجثه)
**Kelex**: Cendek, leş, qodîm.

کەلەخ دار: لەشین
(المجسم، المجسد)
**Kelexdar**: Leşîn.

کەلەخێ مری: جەندەک، تەرم
(الجثه)
**Kelexê mirî**: Cendek, terim.

کەلەخێ مروڤا: کەیس، کەسم، لەش
(الجسد، الجسم، الهيکل)
**Kelexê mirova**: Keys, kesim, leş.

کەلەخێ تشتا: قودیم
(الجرم، الحجم)
**Kelexê tişta**: Qodîm.

کەلەخێ مرار: لەشێ پەرچڤی
(الجيفه)
**Kelexê mirar**: Leşê perçivî.

کەلەخێ ئاڤی: لەشێ ئاڤێ
(الجسم المائی)
**Kelexê avî**: Leşê avî.

کەلە خاڤ: دل مێ، نیڤ بژرتی، نیڤ کەلی
(بيض نصف مستوی)
**Kelexav**: Dilmê, nîv bijirtî, nîv kelî.

کەلەخێ بییانی: لەشی دەرامی
(الجسم الغريب)
**Kelexê bîyanî**: Leşî deramî.

**کەلداچون**: پاشدا چونا لەشی، هەڕشین

(الفنخ، الهزم، الكدم، الثلغ، الشدخ)

**Keldaçûn**: Paşda çûna leşî, herrişîn.

**کەلداچوی**: پاشدا چوی، ڤەقوتای، هنگاتی، هەڕشی

(المثلغ، المشدوخ، المكدوم)

**Keldaçûy**: Paşdaçûy, vequtay, hingatî, herrişî.

**کەلدابرن**: پاشدا برن، هەڕشاندن، هنگاتن

(الاثلاغ، الاكدام، التشديخ، التهزيم)

**Keldabirin**: Paşdabirin, herrişandin, hingatin.

**کەلدا بری**: پاشدا بری، هەڕشاندی، هنگاتی

(المهزم، المكدم، المشدخ)

**Keldabirî**: Paşdabirî, herrişandî, hingatî.

**کەلەژان**: تەحرە، کەل کەلا گەرمێ

(الغتم، شده الحر يكاد يأخذ بالنفس)

**Kelejan**: Tehre, kelkela germê.

**کەلەسویرک**: چێلا هاتی کەل، چێلا گوهنێلێ دخازیت

(البقره فی هياجها الجنسی ونزوتها)

**Keleswîrk**: Çêla hatî kel, çêla guhnêlê dixazît.

**کەلاش**: کالکا پاتەی، پێلاڤا دەزیێت ڤەهاندی، یانی عەڤرم، کام کرن ناڤ تێدانە لداوەتا

(جرموق الغزل المنسوج)

**Kelaş**: Kalka patey, pêlava dezîyêt vehandî, yanî ’evrim, kamkirin nav têdane li daweta.

**کەلاش کەر**: سوول بەندێ چێکرنا پێلاڤێت پاتە ودەزییا

(صانع الجرموق النسيجی)

**Kelaşker**: Solbendê çêkirina pêlavêt pate û dezîya.

**کەلەش**: مێرباش، تێ هەیی، مێر چاک

(الباسل، المغوار، الجسور)

**Keleş**: Mêrbaş, têheyî, mêrçak.

**کەلاشی**: ناڤ دخوەدانا بدرەو، رەنگ دانا وەنە

(المدح الكاذب، التفاخر المزيف، المباهاه، العقيم)

**Kelaşî**: Nav di xwedana bi direw, rengdana wene.

**کەلشتن**: پەقان، تیک بون، دەرزین، دەڤلوبون

(الانفلاق، التصدع، الانشقاق، الانفطار)

**Kelîştin**: Peqan, tîkbûn, derizîn, devlobûn.

**کەلشتی**: پەقای، تیک بوی، دەرزی، دەڤلو بوی

(المنفلق، المتصدع، المشقوق)

**Kelîştî**: Peqay, tîkbûy, derizî, devlobûy.

**کەلاشتن**: پەقاندن، تیک کرن، دەرزاندن، دەڤلوکری

(الافلاق، التفليق، التصديع، التشقيق)

**Kelaştin**: Peqandin, tîkkirin, derizandin.

**کەلاشتی**: پەقاندی، تیک کری، دەرزاندی، دەڤلو کری

(المفلق، المصدع، المفطر، المشقق)

**Kelaştî**: Peqandî, tîkkirî, derizandî, devlokirî.

**کەلە**: لییان، پێلاڤا بەفرێ، کڤانێ سەر بەفرێ رێڤەچونێ

(حذاء الثلج، حذاء خشبی)

**Kele**: Lîyan, pêlava befrê, kivanê ser befrê rêve çûnê.

**کەلەک**: تشتێ زوی دکەلیت

(سريع الغليان)

**Kelek**: Tiştê zwî dikelît.

**کەلەک**: قاییغ، گەمی

(الطوف، البلم، الزورق)

**Kelek**: Qayîx, gemî.

**کەلەک ڤان**: قاییغ ڤان، گەمی ڤان

(ربان البلم)

**Kelekvan**: Qayîxvan, gemîvan.

**کەلەکا بەرا**: شویرها بەرا، موکرا بەرا، بارستا بەرا

(الجثوه، الرصف، القضاض)

**Keleka bera**: Şwîrha bera, mokra bera, brista bera.

**کەلک، کەلکەلانک**: بستیکا هشکا گیا وچاندی، زخت، نێرکا گیای یاهاتی دورین مای دئاخێ را

(الحشفه، سيقان النبات، اليابس)

**Kelik = Kelkelank**: Bistîka hişka gîya û çandî, zixt, nêrka gîyay ya hatî durîn may di axê ra.

**کەلێ کویڤی**: نێریێ کویڤی

(الفدر، اليحمور)

**Kelê kwîvî**: Nêrîyê kwîvî.

**کەلکەلە**: گەرم گەرمە

(الحمی، الوطيس، اوج الحركه، الحماس، التهور، الحده)

**Kelkele**: Gerim germe.

**کەلک سەر**: سەرگەرم، سەرسەک، خوین گەرم، سەرخولولە

(التريع، الطائش، المتهور)

**Kelikser**: Sergerim, sersek, xwîngerim, serxulole.

**کەلک سەری**: خوین گەرمی، سەرگەرمی، سەرسکی، سەر خولولەیی

(الترع، الطیش، التهور، الغلواء)

**Keliksêrî**: Xwîn germî, sergermî, sersikî, ser xuloleyî.

**کەلا گری**: خریقێنک، نورنور، هورهور

(الجهش، الشهق، النهیج)

**Kelagirî**: Xirîqênk, nurrnurr, hurrhurr.

**کەل گەرم**: قەومینا تشتێ لوەختێ خوە، شول کرنا دوەختێ ویدا

(الشیء فی حینه، العمل فی زمنه المناسب)

**Kelgerm**: Qewmîna tiştê liwextê xwe, şol kirina di wextê wîda.

**کەلچک**: کلابە، چەنگال، چەنگالێ ڤەهاندنێ

(الکلابه لنسج الاشیاء)

**Kelçik**: Kilabe, çengal, çengalê vehandinê.

**کەل تەنگ**: هەڤجارێ کوژی تەنگ

(ضیق الزاویه للمحراث ونحوه)

**Kelteng**: Hevcarê kujî teng.

**کەل تەنگی**: تشتێ ڤێک کەتنا وی نەیافرهە

(ضیق المقرق)

**Keltengî**: Tiştê vêkketina wî neya firhe.

**کەلە**: سەرکێ شەکرێ، قەندێ شەکرێ

(قند السکر)

**Kele**: Serkê şekirê, qendê şekirê.

**کەلشتە**: پەق

(الشجنه، البثق، الاخدود، الفلق)

**Kelişte**: Peq.

**کەلشت**: پەق، دەرز، تیک، دەڤلو، ژێک ڤەبوی

(الشلق، السلع، الفطر)

**Kelişt**: Peq, derz, tîk, devlo, jêkvebûy.

**کەلشتا چییای**: پەقا چییای، گەلی کویر، دەرتەنگ، ڤەشکێن

(العسبه، الفالق)

**Kelişta çîyay**: Peqa çîyay, gelîkwîr, derteng, veşkên.

**کەلشتا ئاخێ**: پەقا ئاخێ، نهال

(الاخدود، الاخدید)

**Kelişta axê**: Peqa axê, nihal.

**کەلەکا ئاڤێ**: سێ کولند، قاییغ

(الطوف)

**Keleka avê**: Sê kulind, qayîx.

**کەلیک**: خەلیتکێ دانێ گییایە، توخمەکێ دانێ گییایە کاڤلوژانکەکێ تێوەر، دندکا دکاڤلوژانکی دا توخمەکێ طوڤکێ خارنێ یە بخاڤی دخون

(الجلبان، الجیش، البازلیا)

**Kelîk**: Xelîtekê danê gîyaye, tuxmekê danê gîyaye, kavlojankekê têwer, dindika di kevlojankî da tuxmekê, tovkê xarnêye bi xavî dixon.

**کەلێژ**:

(العجم، العصعص)

**Kelêj**.

**کەلەژان**: تەحرە، کەل کەلاگەرمێ، تەحرەگەزین

(الصهیود، الهیف، القیظ، الوهر، الصهبب، الرمضاء، الاسمقرار)

**Kelejan**: Tehre, kelkela germê, tehregezîn.

**کەرکەروک، کەلەک، کەلکەلانک**: دەپێ هەستییێ پاش ملی، کەرکەروشک، کەرکەروک

(الکتف، لوح الکتف، المنکب)

**Kerkerok = Kelkelk = Kelkelank**: Depê hestîyê paş milî, kerkeroşk, kerkerok.

**کەلەم**: توخمەکێ گییاییێ بەلگ پەحنە دخون خاڤ ولێنای قورمێ وی ژی دخون

(اللهانه، القرنبیط)

**Kelem**: Tuxmekê gîyayê belg pehine dixon xav û lênay qurmê wî jî dixon.

**کەلەمی ببنک**: توخمەکێ کەلەمانە وەکی شێلمێ بنکێ دخون

(الکرنب)

**Kelemê bibinik**: Tuxmekê kelemane wekî şêlimê binkê dixon.

**کەلوتن**: بددانا شکاندن، کراندن

(الکزم، القرض)

**Kelotin**: Bi didana şikandin, kirrandin.

**کەلات**: قەلات، کەل، چەپەر، دیرگەه

(القلعه)

**Kelat**: Qelat, kel, çeper, dîrgih.

**کەلاشتنا ئاڤێ**: شەق کرنا ئاڤێ، برینا ئاڤێ

(المخر، للسفینه وغیرها)

**Kelaştina avê**: Şeqkirina avê, birrîna avê.

**کەلستە**: ئاه، تشتێ ئاڤاهی، تشتێ نژیارا خانیا

(مواد البناء، المادە)

**Keliste**: Ah, tiştê avahî, tiştê nijyara xanîya.

**کەلویش**: گوشتێ لاک، گوشتێ لێواز وسست وخاڤ

(الهرط، اللحم الهزيل كالمخاط)

**Kelwîş**: Goştê lak, goştê lêwaz û sist û xav.

**کەلکێ گییای**: کەلەمێ گییای، بستیکا گییای، نێرکا گییای سێخمێ گییای، زختێ گییای

(السفير، الحشفه، اصول الزرع)

**Kelkê gîyay**: Kelemê gîyay, bistîka gîyay, nêrka gîyay.

**کەلوتکا بەرا**: بەرێت دانای سەرێک ونژنی بۆ ژ ێهەل

(الوجم ،الوحم)

**Kelotka bera**: Berê danay serêk û nijinî bo jêhel.

**کەلەم**: دارکێت بچویک یێت دار و باری

(الاغصان، الصغيره للشجره، القلم)

**Kelem**: Darkêt biçwîk yêt dar û barî.

**کەلی نوک**: نوکێت تەرێت نەگێرەکری هێژ دکەڤلوژانکێ خوەدا

(الحمص الطرى فى سنفه)

**Kelînok**: Nokêt ter yêt ne gêrekirî hêj dikevlojankê xweda.

**کەلندار**: مسری، مروڤێ ئێک تاوزراڤ، مروڤێ مسری یێ بێ گوشت

(النحيف، الهزيل، الطويل من الناس)

**Kelindar**: Misrî, mirovê êk ta û zirav, mirovê misrî yê bê goşt.

**کەلی**: توخمەکێ گییایە ددروین بو ئالف ومشتێ

(نبات عشبى للعلف)

**Kelî**: Tuxmekê gîyaye di durîn bo alif û miştê.

**کەلی سوس**: توخمەکێ گییایێ مشتێ یە

(نبات عشبى، للعلف)

**Kelîsos**: Tuxmekê gîyayê miştêye.

**کەلیا ماری**: کەڤلێ ماری یێ هاڤێتی، پیستێ ماری یێ ژ خوە گورای

(الخرشاء، سلخ الحيه)

**Kelya marî**: *Kevlê marî yê havêtî, pistê marî yê jixwe guray.*

**کەلوتک**: کوما بەرایا ئاڤا کری، بو توخویب وسینورا

(الدعامه، الوجم)

**Kelotk**: Koma bera ya avakirî bo tuxîb û sînora.

**کەلا هەڤجاری**: جهێ ڤێک کەتنا باسک ودندییا هەڤجاری

(اللؤمه للمحراث)

**Kela hevcarî**: Cihê vêkketina bask û dindîya hevcarî.

**کەلیا زەر**: توخمەکێ گییایێ ئالف ومشتێ بو تەرشی ددروین بو زڤستانێ

(نبات عشبى للعلف)

**Kelyazer**: Tuxmekê gîyayê alif û miştê bo terşî didurîn bo zivistanê.

**کەلا برچک**: کەلینا دژوار وپەقویژکا دهەلاڤێت

(النغر، شده الغليان)

**Kela birrçik**: Kelîna dijwar û peqwîjka dihelavêt.

**کەلەتورە**: دەستێ کەڤلێ وی رەق وپەقای ژ بەرشول کرنێ، تیڤل ستوییریا چەرمێ دەستی

(اليد المنفوث من العمل)

**Keletore**: Destê kevlê wî req û peqay ji berşolkirinê, tîvil stwîrîya çermê destî.

**کەلەتورەیی**: دەست زرهانا شول کرنێ وچەرم زرهانێ

(النفث، نفثت اليد من العمل)

**Keltoreyî**: Dest zirhanan şolkirinê û çerim zirhanê.

**کەمەر**: توخمەکێ پەزێ رەش یێ ناڤ تەنگە، رەنگەکێ دی نەشتی لەشی

(الجوزاء، صنف من المعز)

**Kemer**: Tuxmekê pezê reş yê navtenge, rengekê dî neştî leşî.

**کەمەر**: شویتک، کەبەند، شەدەحی، پشت بێن

(النطاق، الحزام)

**Kemer**: Şwîtik, kebend, şedehî, piştbên.

**کەم، کەمو**: ددان شکەستی

(الاثرم، الافرم، مكسور الاسنان)

**Kem = Kemo**: Didan şikestî.

**کەمانچە**: ئامویرەکێ ئاواز گوتنێ یە

(الكمان، آله موسيقيه)

**Kemançe**: Amwîrekê awazgotinê ye.

**کەماسی**: کێماتی، بەرتەنگی

(الندره، القله، النقص)

**Kemasî**: Kematî, bertengî.

**کەموره**: ددان وەرهای، ددان کەتی، دەڤ ڤالا

(الاثرم، الافرم، مکسور الاسنان)

**Kemorre**: Didan werhay, didan ketî, dev vala.

**کەند وکور**: ئەردێ پراسی پراسی، ئەردێ کویزی کویزی، جهێ نزم وبلند، جهێ ڤەشکێن

(الجفجف، الارض المتموجه)

**Kendûkor**: Erdê pirasî pirasî, erdê kwîzî kwîzî cihê nizim û bilind, cihê veşkên.

**کەندئاف**: چیق ئاف

(الجرف القاری، الخلیج)

**Kend av**: Çîqav.

**کەندال**: بەتەن، پەسار، دوربە

(الاوهیه، الخرشاف، الخرشفه)

**Kendal**: Beten, pesar, durrbe.

**کەند**: کور، چال، قور، قەواره، جهێ داکەتی، جهێ نزم، جهێ داچوی

(الوهده، الهوه، الوعق، الهبط، الغور، الغوطه)

**Kend**: Kor, çal, qor, qeware, cihê daketî, cihê nizim, cihê daçûy.

**کەندیلک**: تەختکێ دەزیا ئالاندنێ، گولولکا دەزیا، پەنگا دەزیا

(المکب للغزل)

**Kendîlk**: Textikê dezîya alandinê gulolka dezîya, penga dezîya.

**کەنکەنە**: ماقویل، سەروک، باخوێ، کەڤ خوێ، سەمیان، مەزنێ خەلکی

(الوجیه، النبیل، السید، الزعیم)

**Kenkene**: Maqwîl, serok, baxwê, kevxwê, semyan, mezinê xelkî.

**کەنی**: گرنژین، لیق لیق، تیق تیق

(الضحک)

**Kenî**: Girrnijîn, lîq lîq, tîq tîq.

**کەنین**: گرنژین، لیق لیق کرن، تیق تیق کرن

(الضحکه، التضاحک)

**Kenîn**: Girrnijîn, lîq lîqkirin, tîq tîqkirin.

**کەنی بلندی**: ئەهەهە، لیق لیقا ژ حێل

(القهقهه)

**Kenî bilindî**: Ehe he, lîq lîqa jihêl.

**کەنگی**: کیژ دەمی، کیژ گاڤێ، چ وەخت

(متی)

**Kengî**: Kîjdemî, kîjgavê, çi wext.

**کەنار**: رەخ، تل، تەنشت، ئالی، پال، تەنچ

(الجهه، الصوب، الطرف، الجانب)

**Kenar**: Rex, til, tenişt, alî, pal, tenç.

**کەناری**: دارەکا ستری دژواره بو پەژانا بکار دئینن، کناری دارەکا ستری دره

(شجره شائکه)

**Kenarî**: Dareka stirî dijware bo pejana bi kar di înin, kinarî dareka stirî dirre.

**کەناندن**: گرنژاندن

(الاضحاک)

**Kenandin**: Girrnijandin.

**کەناندی**: گرنژاندی

(المضحک)

Kenandî: Girrnijandî.

**کەندن، کەنین**: بادەرکەتنا ژ زکی، دقونێ را ترکرن، فس کرن، بابەردانا ژ قونێ

(الضرط، خروج الریح من البطن عن طریق الدبر، بظرط)

**Kendin=Kenîn** : Ba derketina ji zikî, di qûnêrra tirrkirin, fiskirin, ba berdana ji qûnê.

**کەنێز**: ناڤ مالک، برادەر، خانوخ

(الندیم، الخدم، افراد الحاشیه)

**Kenêz**: Navmalk, birader, xanox.

**کەنیشتە**: دێرا جوهیا، خانیێ نڤێژێت جوهیا، مەزگەفتا جوهیا

(الکنیسه الیهودیه)

**Kenîşte**: Dêra Cuhya, xanîyê nivêjêt cuhya, mizgefta cuhya.

**کەنگر**: کەرنگ، گیایەکە نێرکا وی خاڤ و لینای دخون، شیرێ وی دبیت قاچک ودجوین

(الکعوب، نبات شائک یؤکل)

**Kengir**: Kerink, gîyayeke nêrka wî xav û lênay dixon, şîrê wî dibît qaçik û di jicwîn.

**کەنگروک**: کولکەکا روی عەردە وەکی چاڤێ ماسیە لکەڤلی دهێت، نەساخییەکا چەرمی یە

(حب الکعوب، عین السمکه، مرض)

**Kengirok**: Kulkeka rwî erde wekî çavê masîye li kevlî dihêt, nesaxîyeka çermîye.

**کەهر**: کارک، گیسک، تێژکا پەزێ ڕەش

(الجدی، العناق)

**Kehir**: Karik, gîsik, têjka pezê reş.

**کەهرا مێ**: کارامێ، گیسکا مێ

(العناق)

**Kehra mê**: Kara mê, gîska mê.

**کەهویر**: گییایەکە یێ بستری یە بو ئالفی بکار دئینن

(نبات عشبی شائک)

**Kehwîr**: Gîyayeke yê bi stirîye bo alifî bikar di înin.

**کەهی**: تشتێ خوەیی، حێوانێ لگەل مروڤا دژیت، حێوانێ گورێ خوە ددەت مروڤا، هەڤ گور

(الالیف، الداجن، الانیس)

**Kehî**: Tiştê xwe yî, hêwanê ligel mirova dijît, hêwanê gorê xwe didet mirova, hevgor.

**کەهی بون**: خوەیی بون، گور دان، هەڤ گور بون

(التآلف، الاستئناس، التدجن)

**Kehîbûn**: Xweyîbûn, gorday, hevgurbûn.

**کەهی بوی**: خوەیی بوی، گوردای، هەڤ گور بوی

(المدجن، المؤآلف، المؤنس)

**Kehîbûy**: Xweyîbûy, gorbûy, hevgorbûy.

**کەهی تر**: خوەیی تر، گوردای تر، هەڤ گورتر

(الألف، الادجن، الائنس)

**Kehîtir**: Xwetîtir, gordaytir, hevgortir.

**کەهی کرن**: خوەیی کرن، هەڤ گور کرن

(الادجان، الایناس)

**Kehîkirin**: Xweyîkirin, hevgorkirin.

**کەهیاتی**: خوەیاتی، هەڤ گوری، هەڤ گوریاتی

(الالفە، الدجنە، الانس)

**Kehîyatî**: Xweyatî, hevgorî, hevgoriyatî.

**کەهنی**: کانی، زێ، کونا ئاڤ زانێ، چاڤیکا زانا ئاڤێ، کون ئاڤ

(النبع، الینبوع، عین الماء)

**Kehnî**: Kanî, zê, kuna av zanê, çavîka zana avê, kun av.

**کەهنیا چاڤی**: کانیکا چاڤی، ڕەخێ چاڤی یێ نک دفنێ، ڤێک کەتنا فروزا چاڤی بلایێ دفنێ ڤە

(الموق، المؤق)

**Kehnîya çavî**: Kanîka çavî, rexê çavî yê nik difnê, vêk ketina firoza çavî bi layê difnêve.

**کەهیا**: کویخە، کەڤ خوێ، مەزنێ گوندی، سەمیانێ تاخی

(المختار، العمده)

**Kehya**: Kwîxe, kev xwê, mezinê gundî, semyanê taxî.

**کەو**: تەیرەکێ چەلەک لاوە خاندنا وی دبێژنێ قەبین تەیرەکە لجهێ زوزانا سار دژیت

(الحجل، القبج)

**Kew**: Teyrekê çelek lawe, xandina wî dibêjinê qebîn teyreke li cihê zozana sar dijît.

**کەوال**: تەرش، پەز وحێوان، سەڕ، مەروماڵات

(الماشیه، الغنم)

**Kewal**: Terş, pez û hêwan, serr, mer û malat.

**کەوتە**: کەرێ پەزی، برا پەزی، جەلەبێ پەزی

(قطیع الغنم)

**Kewte**: Kerê pezî, birra pezî, celebê pezî.

**کەوا زک**: گوزک، جەرکێ ئاڤ ڤەخارنێ، بەقوک

(القاروره، کوز الماء)

**Kewazk**: Gozik, cerkê av vexarnê, beqok.

**کەو سویسک**: توخمەکێ کەوانە

(صنف من القبج، الحجل)

**Kew swîsk**: Tuxmekê kewane.

**کەو دەری**: توخمەکێ تەیرانە لچیایێت بلند دژیت

(صنف من الطیور)

**Kewderî**: Tuxmekê teyrane li çîya yêt bilind dijît.

**کەو زەرک**: توخمەکێ کەوایە

(صنف من القبج الحجل)

**Kewzerk**: Tuxmekê kewaye.

**کەو فڕ**: بەروداریت بلند لدوریت سویتا کەوا هەژا ددانن سەر، دا کەو نەچن سەر بفڕن بپییابچن

(محل طیران القبج فی المصیده)

**Kewfirr**: Ber û darêt bilind li dorêt swîta kewa heja didanin ser, da kew neçin ser bifirin bi pîya biçin.

**کەوکوژ**: سویتا کەوگر، سویتا باش بو نێرچیرێ

(المصیده الجیده للصید)

**Kewkuj**: Swîta kewgir, swîta baş bo nêrçîrê.

**کەوهە**: دەرمانێ تیژ ودژوار بکەن برینێ پێ بسوژن، برین داخ کرنا بدەرمانی

(الدواء الحريف يداوى به الجروح)

**Kewhe**: Dermanê tîj û dijwar biken birînê pê bi sojin, birîn daxkirina bi dermanî.

**کەودەن**: مروڤێ گەوشەک، باهێلە، نەدیمە، ئاقل سڤک، نەزان، تێ نەگهشتی، دەبەنگ

(الغبی، البليد، المغفل)

**Kewden**: Mirovê gewşek, bahêle, nedîme, aqil sivik, nezan, têne gihiştî, debeng.

**کەودەنی**: گەوشەکی، باهێلەیی، نەدیمی، ئاقل سڤکی، تێ نەگەهشتنی، دەبەنگی

(الغفله، البلاده، الغباوه، الجهل)

**Kewdenî**: Gewşekî, bahêleyî, nedîmî, aqilsivikî, tênegehiştî, debengî.

**کەوهان**: داخ بونا بدەرمانی، سوتنا بدەرمانێ تیژ و دژوار

(الاكتواء)

**Kewhan**: Daxbûna bi dermanî, sotina bi dermanê tîj û diwar.

**کەوهای**: برینا هاتی کەواندن

(المكتوى)

**Kewhay**: Birîna hatî kewandin.

**کەواندن**: سوتنا بدەرمانێ دژوار، داخ کرنا بدەرمانێ تیژ

(الكى)

**Kewandin**: Sotina bi dermanê dijwar, daxkirina bi dermanê tîj.

**کەواندی**: برینا داخ کری بدەرمانی، برینا دەرمان کری

(المكوى)

**Kewandî**: Birîna daxkirî bi dermanî, birîna dermankirî.

**کەوێ نێر**: نێرکەو

(اليعقوب)

**Kewnêr**: Nêrkew.

**کەوگیرڤان**: نێرچیرڤانێ کەوا، کەوگر

(صياد القبوج)

**Kewgîrvan**: Nêrçîrvanê kewa, kewgir.

**کەوگیرڤانی**: نێرچیرا کەوا، راڤا کەوا

(صيد القبوج، مهنه الصيد للحجل)

**Kewgîrvanî**: Nêrçîra kewa, rava kewa.

**کەیس**: بەژن، کەسمە، چەکوچ، قودیم، کەلەخ، لەش، بەژن وبالا، قەلافەت، دار

(السمخه، حسن الطلعه والنوع)

**Keys**: Bejin, kesme, çekûç, qudîm, kelex, leş, bejin û bala, qelafet, dar.

**کەیس**: قودیم، کەسمە، کەلەخ

(القالب، الحجم، الهيكل، الهيئه، القامه، الهيئه)

**Keys**: Qodîm, kesme, kelex.

**کەیس**: دەلیڤێ ڤەرویچکاندنێ، دەرفەتا حیلە لێ کرنێ، دەرفەت دیتنا چویراندنێ، دەراڤێ چویرکرنێ

(الاستغلال، مجال الاستغلال)

**Keys**: Delîvê verwîçkandinê, derfeta hîlelêkirinê, derfet dîtina çwîrandinê, deravê cwîrkirinê.

**کەیس دیتن**: دەراڤ دیتنا حیلە و ژێ چویر کرنێ

(فرصه الاستغلال)

**Keys dîtin**: Deravdîtina hîle û jê çwîrkirnê.

**کەیف پێ هاتنا دوژمنی**: هەلنگفتنا دوژمنی بێهنا وی پێ بهێت، تویش بونا نەیار پێ تەنا دبیت

(التشميت، التشفى)

**Keyf pêhatina dujminî**: Helingiftina dujminî bêhna wî pê bihêt, twîş bûna neyar pê tena dibît.

**کەیف**: شادی، بەستی

(الطرب، الفرح، الجذل، الغبطه، السرور)

**Keyf**: Şadî, bestî.

**کەیفین**: شادمان، بەست بوی

(الجذلان، الفرحان، المسرور)

**Keyfîn**: Şadman, bestbûy.

**کەیف خوەش**: دل خوەشی، بشکوری، ڤەبوی، گرنژی

(المرح، البشوش، المبتهج)

**Keyfxweş**: Dilxweşî, bişkurrî, vebûy, girrnijî.

**کەیف خوەشی**: دل خوەشی، بشکورین، دل ڤەبون، گرنژین

(السرور، الفرح، الغبطه، الجذل)

**Keyfxweşî**: Dilxweşî, bişkurrîn, dilvebûn, girrnijîn.

**کەیلان**: شەنگ، شوخ، جان، تازە، لاو، خوشکوک، خوشیمانک

(الوسيم، الظريف، الجميل)

**Keylan**: Şeng, şox, can, taze, law, xuşkok, xoşîmank.

